العذر بالجهل

شیكردنەوەی

# الرسالة في عدم العذر بالجهل

نووسینی

## العلامة عبدالله بن عبدالرحمن أبا بطين

مفتي البلاد النجدية (١١٩٤ هـ - ١٢٨٢ هـ)

شیكردنەوە و تەعلیق

## هاوكار كوردی

هاوكار

1441 - 2020



| | | |
|---|---|---|
| | قال أمير المؤمنين عمر بن عبد العزيز "لا عذر لأحد بعد السنة، في ضلالة ركبها، يحسب أنه على هدى "<br><br>**واته : عومەری کوڕی عبدالعزیز دەفەرموویت : هیچ عوزرێك نیە پاش سوونەت بۆ ئەو کەسەی لەسەر گومڕاییە وا گومان دەبات لەسەر هیدایەتە**<br><br>**سەرچاوە : کتاب السنە للمروزی بە ژمارە :** 95<br><br>**حکمە : صحیح اسناد** | |

## کورتەیەك لە ژیانی ( العلامة عبدالله بن عبدالرحمن أبا بُطين )

**ناو و نەسەبی : شێخی عەلامەی فەقیھ باوكی عبدالرحمن عبدالله كوڕی عبدالعزیزی كوڕی عبدالرحمن كوڕی عبدالله كوڕی سوڵتان كوڕی خەمیس , وەك باوك و باپیرانی ناسراوە بە ( أبا بُطين )** [1] **لە زانایانی موتەئەخیرینی مەزھەبی حەنبەلیە لە ساڵەكانی سەدەی سێزدەی كۆچی لە سەردەمی دەوڵەتی سعودی دووھەم ژیاوە یەكێكە لە ئەستێرەكانی وڵاتی نەجد كە بە نەسەبی ( العائذي ) لە سكی عوبەیدەی قەحتانی لە دایك بووە .**

**لە دایك بوونی : لە شاری ( الروضة ) لە گوندی ( سَدير ) لە بیستی ( ٢٠ ) مانگی زوالقەعیدە لە ساڵی ( ١١٩٤ ) كۆچی لە دایك بووە .**

**مەزھەب و عەقیدەی : لە ( أصول ) بیروباوڕ سەلەفی بووە وە لە ( الفروع ) مەزھەب حەنبەلی بووە .**

---

(١).نازناوی ( أبا بُطين ) نازناوی باپیری شێخە بەناوی ( عبدالله كوڕی سوڵتان ) وشەی ( بُطَين ) بچوكراوەی ( بَطْن ) واتە : سك ھۆكاری ئەم نازناوە چیە ؟ باپیری شێخ عبدالله كوڕی سوڵتان ڕۆژێكیان لە بازاڕی ڕەوزەی سەدیر لە مەجلیسێك دانیشتبوو لەگەڵ پیاوێكی دەشتەكی خەریكی موعامەلەكردنی بەروبوومی ئاژەڵی وەك ڕۆن و شیر و ئەوشتانە بوو , ئەم پیاوە ناوی باپیری شێخی كە عبدالله بوو نەدەزانی بۆیە كەمێك بابەتی حیساب و كڕین و فرۆشتنیان لە نێوان مابوو دوای چەند ڕۆژێك ئەم پیاوە دەشتەكیە ھاتەوە بۆ بازاڕ بەڵام باپیری شێخی نەدۆزیەوە پرسیاری لەخەڵك كرد كە بۆچی دیار نیە لەبەر ئەوەی ناوەكەی نەدەزانی بە وەسف بە خەڵكی دەوت : پیاوێكی سك گەورە و دیاربوو , بۆیە لەو كاتەوە ئەم ناوەی پێوە لكا (أبا بُطين) خاوەن سكە گەورەكە , جا ئەم نازناوە جیل بە جیل بۆ نەوەكانی مایەوە تا گەیشتە شێخ , سەرچاوەی ئەم بابەتە سەیری كتێبی ( علماء نجد خلال ستة قرون )بەرگ و پەڕاوی : ٥٦٧/٢.

**داواکردنی زانستی :** باوکی فێره باشترین ڕەوشتی کرد , هەر لە بچوکیەوە قورئانی گشت لەبەر کرد , هەر لە منداڵیەوە چووە خزمەت زانستەکانی قورئان و سوونەت و ئەوانی تر , سەرەتا لە شارەکەی خۆی ( الروضة ) لە ساڵی ( ١٢٢٥ ) لەلای شێخی موفتی : محمدی کوڕی حاج عبدالله کوڕی تەڕادی دووسەری حەنبەلی خوێندی , کاتێ شێخ محمد کوڕی تەڕاد کۆچی کرد بۆ وڵاتی شام ئەویش لەگەڵی کۆچی کرد و لەلای زانایانی ئەم وڵات بە تایبەت ئیمامی سەفارینی و قوتابیانی درێژەی بە خوێندندا , لە پاشان کۆچی کرد بۆ شاری ( شقراء ) لە خزمەت ئیمامی وڵات , موفتی گشتی وڵات , ئەستێرەی زانست , نزیکترین قوتابی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب : شێخ عبدالعزیزی کوڕی عبدالله تەمیمی کە ساڵی (١٢٣٧ ) کۆچی دوایی کردووە خوێندوویەتی , کە چەند ساڵێك بەردەوام لە خزمەتی بووە , بە تایبەت زانستی تەفسیر و فەرموودەی لای خوێندووە , شێخ عبدالله ابا بطین ئەوەندە زیرەك بووە زۆرجار شێخ عبدالعزیزی تەمیمی لە جیاتی خۆی فەتوای چەندین بابەتی فیقهی و ئەوانی تری پێداوە دواتر دەچێتە شاری ( الدرعية ) لە خزمەت زانایانی ئەوێ خوێندوویەتی دیارترینیان : شێخی عەلامە عبدالله کوڕی محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕەحمەتی الله تعالی برژێ بەسەریاندا کە لە ساڵی ( ١٢٤٤ ) کۆچی شەهید بووە , هەروەها لای شێخی عەلامە ئەحمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی ڕەشیدی عەفالیقی ئەحسائی مەدنی حەنبەلی کە ساڵی (١٢٥٧) کۆچی وەفاتی کردووە خوێندوویەتی , وە لای شێخی عەلامە حمدی کوڕی ناصری کوڕی عوسمانی کوڕی مەعمەری تەمیمی کە ساڵی ( ١٢٢٥ ) کۆچی وەفاتی کردووە خوێندوویەتی , کە یەکێکە لە قوتابیەکانی شێخی ئیسلام موحەمەدی کوڕی عبدالوهابە , وە زانستی نەحو و صەرفی لای شێخی ئەدیبی نەحوی سەید حوسەینی کوڕی عبدالرحمن جەفری کە ساڵی (١٢٥٨) کۆچی وەفاتی کردووە خوێندووە .

**قەزاوەتی وەك قازی** : پاش ئەوەی کە دامەزرا لە زانست و زانیاری وە ناوبانگی تەواوی وڵاتی حیجازی گرتەوە ئیمام سعودی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی موحەمەدی کوڕی سعود لە ساڵی ( ١٢٢٠ ) کۆچی کردبە قازی لەسەر شاری تائیف و دەوروبەری دواتر کردی بە قازی بەسەر مەکە و مەدینە , هەرلەوێ دانیشت و دەستی کرد بە دەرس وتنەوە سەدان قوتابی ناوەخۆ و دەورو بەر لە خزمەتی درووست بوون .

**هەندێك لە سیفات و ئاکاری** : شێخ خاوەن ئاکارێکی بەرز بوو , هەردەم قسە خۆش و دەم بە خەندە بوو , بە شەخصیەت و هەیبەت بوو , فڕێکی مام ناوەندی هەبوو , حەزی بە ناوبانگ نەبوو , زۆر ڕیزداربوو , هەموو شەوێك حیزبێك لە قورئانی دەخوێند , دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو , بە تەواوی زانستی تەجویدەوە دەیخوێندەوە , بە حەوت جۆر قورئانی ( قراءات السبع ) دەخوێند , بە تایبەت لە نوێژدا , دەست و خەتی زۆر نایاب و جوان بووە , لەبەرکردنێکی بەهێز و خێرای هەبوو , زۆری دەخوێندەوە , بە جۆرێك ئەو کتێبانەی خۆی زیاد لە دووجار دەیخوێندەوە وە بە ئیستعارە کتێبی وەردەگرت بۆ ئەوەی بیان خوێنتەوە , هەرگیز بێزار نەدەبوو لە خوێندنەوە , زۆر سەخی بوو , زۆر بێدەنگ بوو کەم قسەی دەکرد , عیبادەت و شەونوێژی زۆربووە , زۆر پابەند بووە بە دەرس و وتار خوێندنەوە , هەمیشە دەرس وتنەوە و وتاری لە دوای نوێژی عەصر و نێوان مەغریب و عیشا بووە , کەم هاتووچۆی خەڵکی دەکرد لای دەسەڵاتداران زۆر ڕێز لێگیراو بوو , ئازابووە لە حەق وتن , لەکەس نەترساوە جگە لە الله تعالی.

**قوتابیەکانی** : زیاد لە ٢٠٠ قوتابی بەردەوامی هەبووە ئەمانەش کەمێك لە قوتابیەکانی : شێخ محمد بن عبدالله بن مانع ( ت ١٢٩١ ) شێخ محمد بن عبدالله بن سليم ( ت ١٣٢٩ ) شێخ علی بن محمد بن راشد ( ت ١٣٠٣ ) شێخ عبدالعزيز بن ابراهيم ال عبداللطيف ( ت ١٣١٠ ) وە چەندینی تر .

مەدحی زانایان لەسەری :

**یەکەم** : شێخ عبدالرحمن کوڕی حەسەنی کوڕی شێخ موحەمەدی کوڕی عبدالوهاب دەفەرمووێت : برایەکی ڕاستگۆم بوو , زۆر زانستی خۆشەویست .

**دووهەم** : شێخ ئەحمەد کوڕی حەسەنی کوڕی ڕەشیدی ئەحسائی دەفەرمووێت : خاوەن ڕەوشتی چاك بوو , وە سیفەتی چاك , برایەکم بوو لە پێناو الله تعالی , زۆر خۆشەویست بوو .

**سێ یەم** : شێخ موحومەدی کوڕی عبدالله کوڕی حومەید دەفەرمووێت : خوێندنەوەی وردی هەموو مەزهەبەکانی هەبوو , کتێبەکانی غەیری سەلەفی دەخوێندەوە .

**چوارەم** : شێخ عوسمانی کوڕی عبدالله کوڕی بیشر دەفەرمووێت : شێخێکی عالم بوو , تاکە کەس بوو لە وردی لێکۆڵینەوەی مەزهەبەکان لەسەردەمی خۆی , سەرۆکی ڕەوشت بەرزان بوو خاوەن وەرع و نەرم و نیانی بوو , هەموو زانایەك شانازی پێوە دەکرد , کۆکەرەوەی گشت زانستەکان بوو .

**پێنجەم** : شێخ عبدالعزیز کوڕی ئیبراهیم کوڕی عبداللطیف دەفەرمووێت : شێخی ئیمامە زانایەك و فەقیهە , الله پەرستێکی خۆ پارێزە , الله ناسە و زاهیدە .

**شەشەم** : شێخ سلێمانی کوڕی سیحمان دەفەرمووێت : شێخی عەلامەی ڕۆژگاری خۆی بوو ,بیرتێژ بوو , تاکی سەردەمەکەی بوو , زیرەکترینی نزیکەکانی بوو , ڕاوچی وشە و مانا بوو حافز بوو , خاوەن ورەیەکی بێ وێنەبوو , موفتی دیاری مەملەکەتی نەجد بوو , دەگمەنی سەردەمی خۆی بوو , جوانی ڕۆژگاربوو .

**حەوتەم : شێخ عبدالرحمن کوڕی قاسم دەفەرمووێت : ئیمام و عەلامەی ڕۆژگار , فەقیە و بەحری زنست بوو , وردبین و بیرتیژ بوو , لێکۆڵەرێکی سەرکەوتوو بوو , سوودبەخش بوو بۆ زانستخوازان , سەربڕی ئەهلی بیدەع و گومان ویستان بوو , شێخی ئیسلام بوو .**

**هەشتەم : شێخ ئیبراهیم کوڕی عوبێد ال عبدالمحسن دەفەرمووێت : بەحرێکی بێ بن بوو ,زانستەکەی مەشهور بوو لە ناو مرۆڤەکان و جنۆکەکان , شمشێری الله تعالی بوو بۆ گەردەنی کافران , وە تیرێکی پێکراوبوو بۆ دڵی دەرچوان لە دین بوو ,**

**بەرهەمەکانی :**

**یەکەم :** الإنصار لحزب الله الموحدین والرد علی المجادل عن المشرکین , رد علی ابن جرجیس.

**دووهەم :** تأسیس التقدیس في کشف شبهات ابن جرجیس .

**سێ یەم :** الرد علی قصیدة البردة .

**چوارەم :** الحجة والبرهان في الرد علی من قال بخلق القرأن .

**پێنجەم :** رد شبهات علی التوحید .

**شەشەم :** کتاب التکفیر وأحکامه . **ئەم ڕیسالەی بەردەستت کە شیکردنەوەم بۆی کردووە بەشێکە لەم کتێبە .**

**حەوتەم : شیکردنەوە و تەعلیقات و کورت کردنەوەی کۆمەڵێ کتێبی ئەهلی علم .**

**وەفاتی** : لە ساڵی ( ١٢٧٠ )کۆچی .دوای ئەوەی شێخ لە شاری ( عنيزة ) لەسەر داوای خانەوادەکەی کە چوونە لای پادشای ئەم سەردەم ئیمام فەیصەل کە ئیلحاح لە شێخ بکات بگەڕێتەوە بۆ شاری ( شقراء ) پاش ئەوەی کە گەڕایەوە لەوێ دەستی بە دەرس وتنەوە کرد تاوەکو تەواو بیرپوو و تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو سەرئەنجام لە (٧) جەمادی یەکەمی ساڵی (١٢٨٢) کۆچی وەفاتی کرد و گیانە پاکەکەی بەرەو دیداری الله تعالى بەرزبۆیەوە , الله تعالى جەزای بەخێیری لە جیاتی ئومەتی ئیسلام باتەوە و بیخاتە بەهەشتەکەی [٢]

---

(٢).**بۆ زانیاری زیاتر سەیری ئەمانە بکە** : السحب الوابلة على ضرائح الحنابلة ٦٢٦/٢,فيض الملك الوهاب المتعالى بأنباء أوائل القرن الثالث عشر والتوالي ٩٣٣/٢ , الدرر السنية في الأجوبة النجدية ٤٢٦/١٦ , الأعلام للزركلى ٩٧/٤ تراجم لمتأخري الحنابلة ص : ٨٨ , مشاهير علماء نجد وغيرهم ص : ١٧٦ , علماء الدعوة ص : ١٣٣ , تسهيل السابلة لمريد معرفة الحنابلة ١٧٠٢/٣ , علماء نجد خلال ستة قرون ٥٦٧/٢ .

بسم الله الرحمن الرحيم

(الوقوع في بعض المكفرات جهلا)

وسئل الشيخ عبد الله بن عبد الرحمن أبا بطين، رحمه الله: عمن ارتكب شيئا من المكفرات جهلا، يكفر إذا كان جاهلا بكون ما ارتكبه كفر، أم لا؟فأجاب: قال تعالى: {إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُدَ زَبُوراً وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً}

فلا عذر لأحد بعد بعثة محمد صلى الله عليه وسلم في عدم الإيمان به وبما جاء به، بكونه لم يفهم حجج الله وبيناته لأن الله سبحانه أخبر عن الكفار بعدم الفهم، فقال تعالى: {وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً}2 وقال: {إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ} 3 وقال: {صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَعْقِلُونَ}

والآيات في وصفهم بغاية الجهل، كثيرة معلومة، فلم يعذرهم تعالى بكونهم لم يفهموا، بل صرح بتكفير هذا الجنس، وأنهم من أهل النار، كما في قوله تعالى: {قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآياتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً} وقوله: {وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِنَ الْجِنِّ وَالْأِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ}

قال الشيخ أبو محمد المقدسي، لما انجر كلامه في مسألة: هل كل مجتهد مصيب، أم لا؟

ورجح ما هو الحق في ذلك، وهو: أنه ليس كل مجتهد مصيبا، بل الحق في قول واحد من أقوال المجتهدين; قال: وزعم الجاحظ أن مخالف ملة الإسلام، إذا نظر فعجز عن إدراك الحق، فهو معذور غير آثم، - إلى أن قال: وأما ما ذهب إليه الجاحظ، فباطل يقينا، وكفر بالله، ورد عليه وعلى رسوله.

فإنا نعلم قطعا: أن النبي صلى الله عليه وسلم أمر اليهود والنصارى بالإسلام واتباعه، وذمهم على إصرارهم، وقاتل جميعهم، وقتل البالغ منهم، ونعلم أن المعاند العارف مما يقل، وإنما الأكثر مقلدة، اعتقدوا دين آبائهم تقليدا، ولم يعرفوا معجزة الرسول صلى الله عليه وسلم وصدقه.

قال: والآيات الدالة على هذا كثيرة من القرآن، كقوله تعالى: {ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ} {وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنْتُمْ بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ مِنَ الْخَاسِرِينَ} 3، {وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ} وقوله: {وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ} 5، {وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ} {الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً} وفي الجملة: ذم المكذبين لرسوله صلى الله عليه وسلم مما لا ينحصر في الكتاب والسنة، انتهى كلامه رحمه الله.

فبين رحمه الله: أنا لو لم نكفر إلا العارف المعاند، لزمنا أن لا نكفر اليهود والنصارى، وهذا من أبطل الباطل.

وأما قول الشيخ رحمه الله، لما ذكر شيئا من أنواع الشرك الحادث في هذه الأمة، قال: لكن لغلبة الجهل، وقلة العلم بآثار الرسالة في كثير من المتأخرين، لم يمكن تكفيرهم بذلك، حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم، لم يقل: حتى يتبين، فتحقق منهم العناد بعد المعرفة.
قال رحمه الله في بعض كتبه، لما ذكر بعض ما يفعله كثير من الكفار، والخروج بذلك عن الإسلام قال: وهذا كثير غالب، لا سيما في الأعصار والأمصار، التي تغلب فيها الجاهلية والكفر والنفاق فلهؤلاء من عجائب الجهل، والظلم، والكذب، والنفاق، والضلال، ما لا يتسع لذكره المقام.
وإذا كان في المقالات الخفية، فقد يقال فيها إنه مخطئ ضال، لم تقم عليه الحجة التي يكفر صاحبها لكن ذلك يقع من طوائف منهم، في الأحوال الظاهرة التي يعلم الخاصة والعامة من المسلمين، أنها من دين الإسلام
بل اليهود والنصارى، والمشركون، يعلمون أن محمدا صلى الله عليه وسلم بعث بها، وكفر من خالفها، مثل أمره بعبادة الله وحده لا شريك له، ونهيه عن عبادة أحد سوى الله، من الملائكة والنبيين أو غيرهم؛ فإن هذا أظهر شعائر الإسلام، ومثل هذا: معاداة اليهود والنصارى والمشركين ومثل تحريم الفواحش، والربا والخمر والميسر، ونحو ذلك، ثم تجد كثيرا من رؤوسهم وقعوا في هذه الأنواع، فكانوا مرتدين، وإن كانوا قد يتوبون من ذلك، أو يعودون إلى أن قال:
وأبلغ من ذلك: أن منهم من يصنف في دين المشركين، والردة عن الإسلام، كما صنف الرازي كتابه في عبادة الكواكب، وأقام الأدلة على حسن ذلك، ومنفعته، ورغب فيه؛ وهذه ردة عن الإسلام باتفاق المسلمين، وإن كان قد يكون عاد إلى الإسلام، انتهى.
فانظر إلى تفريقه بين المقالات الخفية، والأمور الظاهرة' فقال في المقالات الخفية التي هي كفر: قد يقال: إنه فيها مخطئ ضال، لم تقم عليه الحجة التي يكفر صاحبها، ولم يقل ذلك في الأمور الظاهرة بل قال: ثم تجد كثيرا من رؤوسهم وقعوا في هذه الأمور، فكانوا مرتدين، فحكم بردتهم مطلقا، ولم يتوقف في الجاهل.
فكلامه ظاهر: في التفرقة بين الأمور المكفرة الخفية، كالجهل ببعض الصفات ونحوها، فلا يكفر بها الجاهل، كقوله للجهمية: أنتم عندي لا تكفرون لأنكم جهال، وقال فيمن ارتكب بعض أنواع الشرك جهلا، لم يمكن تكفيرهم حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم، ولم يقل: لم يمكن تكفيرهم، لأنهم جهال، كما قال في المنكر لبعض الصفات جهلا؛ بل قال: لم يمكن تكفيرهم حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم فلم ينتهوا، أو إن كانوا جهالا، مع أن قول الشيخ رحمه الله، في عدم تكفير الجهمية ونحوهم، خلاف المشهور في المذهب؛ فإن الصحيح من المذهب: تكفير المجتهد الداعي إلى القول بخلق القرآن، ونفي الرؤية ونحو ذلك.
قال المجد رحمه الله: الصحيح: أن كل بدعة كفرنا فيها الداعية، فإنا نفسق المقلد فيها، كمن يقول بخلق القرآن، أو أن علم الله سبحانه مخلوق، أو أسماءه مخلوقة، أو أنه لا يرى في الآخرة، أو يسب الصحابة، أو أن الإيمان مجرد الاعتقاد، ونحو ذلك؛ فمن كان عالما في شيء من هذه البدع، يدعو إليه، ويناظر عليه، فهو محكوم بكفره، نص أحمد على ذلك في مواضع، انتهى.
فتبين: أن الصحيح من المذهب تكفيره، ولم يعذرهم بالجهل.

ومما يوضح المسألة: ما هو معلوم من حكم أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم ومن بعدهم في المرتد، أنه يستتاب فإن تاب وإلا قتلوه، ولم يتوقفوا في قتله حتى تتحقق منه المعاندة؛ وكذلك العلماء في المذاهب، ذكروا حكم من كانت ردته بإنكار ما يمكن جهله به، أنه يعرف ذلك، فإن أصر قتل، ولم يعتبروا تحقق العناد منه، كما قالوا فيمن جحد تحريم الخمر ونحوه، أو شك فيه ومثله لا يجهله، كفر، وإن كان مثله يجهله عرف، فإن أصر بعد التعريف كفر وقُتل، ولم يعتبروا المعاندة.
وأيضا، فقد دل القرآن على أن الشك في الجملة كفر، كما في قوله تعالى في الكفار: {قُلْتُمْ مَا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِنْ نَظُنُّ إِلَّا ظَنّاً وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ} وغير ذلك من الآيات الصريحة؛ والشك غير العناد وهذا ظاهر بحمد الله تعالى.
ومما يبين لك مراد الشيخ تقي الدين رحمه الله، ما ذكره في بعض كتبه، بقوله: من اعتقد أن زيارة أهل الذمة كنائسهم قربة إلى الله فهو مرتد، وإن جهل أن ذلك الأمر محرم عرف ذلك، فإن أصر صار مرتدا; وقال: من سب الصحابة أو واحدا منهم، واقترن بسبه دعوى أن عليا إله أو نبي، أو أن جبريل غلط، فلا نشك في كفره، بل لا شك في كفر من توقف في تكفيره.
وقال أيضا: من زعم أن الصحابة ارتدوا بعد رسول الله صلى الله عليه وسلم إلا نفرا قليلا لا يبلغون بضعة عشر، أو أنهم فسقوا، فلا ريب في كفر قائل ذلك، بل من شك في كفره فهو كافر، انتهى.
فانظر تكفيره الشاك، مع القطع بأن سبب الشك هو الجهل، وأطلق على من ذكر مع العلم القاطع بأن أكثر هؤلاء أو كلهم جهال لم يعلموا أن ما قالوه كفر.
وقال أيضا: فكل من غلا في نبي، أو رجل صالح، وجعل فيه نوعا من الإلهية، مثل أن يدعوه من دون الله، مثل أن يقول: يا فلان أغثني، أو ارحمني، أو انصرني، أو اجبرني، أو توكلت عليك، أو أنا في حسبك أو أنت في حسبي، ونحو هذه الأقوال، التي هي من خصائص الربوبية، التي لا تصلح إلا لله، فكل هذا شرك وضلال، يستتاب صاحبه، فإن تاب وإلا قتل، انتهى.
ولم يخص القتل بمن تحقق منه العناد، ولم يقل في هؤلاء ونحوهم: لم يكفروا لأنهم جهال، كما قال في الجهمية، وهذا كثير في كلامه رحمه الله.
وقال أيضا: لما استحل طائفة من الصحابة والتابعين، الخمر، كقدامة وأصحابه، وظنوا أنها تباح لمن آمن وعمل صالحا، على ما فهموا من آية المائدة، اتفق علماء الصحابة كعمر وعلي وغيرهما، على أنهم يستتابون، فإن أصروا على الاستحلال كفروا، وإن أقروا به جلدوا؛ فلم يكفروهم بالاستحلال ابتداء، لأجل الشبهة حتى يبين لهم الحق، فإن أصروا كفروا، انتهى.
فانظر كيف حكم الصحابة بكفرهم، لو أصروا بعد الاستتابة، ولم يعذروهم بعد المعرفة، وبعد التعريف، فأوضح مما ذكرناه: ضلالا من لم يكفر من ارتكب ما هو كفر، إلا إذا كان معاندا، وأن هذا مخالف للكتاب والسنة، وإجماع الأمة.
فكيف يقول هذا فيمن يشك في وجوب الرب سبحانه وتعالى، أو في وحدانيته، أو يشك في نبوة محمد صلى الله عليه وسلم أو في البعث بعد الموت، فإن طرد أصله في ذلك فهو كافر بلا شك، كما قرره موفق الدين في كلامه المتقدم، وإن لم يطرد أصله في ذلك، فلم لا يعذر بالشك في هذه الأشياء، وعذر فاعل الشرك الأكبر، المناقض لشهادة أن لا إله إلا الله، التي هي أصل دين الإسلام بجهله؛ فهذا تناقض ظاهر.

فقد بين أنه لا عذر لأحد في الجهل بهذه الأمور ونحوها، بعد بعثته صلى الله عليه وسلم وبلوغ حجج الله وبيناته، وإن لم يفهمها من بلغته، فحجة الله قائمة على عباده ببلوغ الحجلا بفهمها، فبلوغ الحجة شيء وفهمها شيء آخر؛ ولهذا لم يعذر الله الكفار بعدم فهمهم، بعد أن بلغتهم حجته وبيناته، وهذا ظاهر بحمد الله. فنسأل الله ألا يزيـغ قلوبنا بعد إذ هدانا وأن يهب لنا من لدنه رحمة إنه هو الوهاب.

**پێشەکی ( م.هاوکارکوردی )**

**بسم الله الرحمن الرحیم**

الحمدالله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه محمد صلى الله عليه وسلم وصحبه وسلم تسليما أما بعد :

**سوپاس بۆ الله تعالی دووبارە دەرفەتی پێ بەخشینەوە کە بچینەوە خزمەت شیکردنەوە و تەعلیق لەسەر ڕیسالەیەکی تر لە ڕیسالەکانی تەوحید و یەکخوا پەرستی , بەتایبەت لە بابەتە گرینگ و هەستیارەکانی ( کوفر و شیرك و عوزر تێیاندا ) کە بەڕاستی ئەم باسە جێگای چاوەشەکردنی زۆرێك لە بانگخوازە تەلبیس کارەکانی ئەم سەردەمەی خۆمانە هەر ئەوەشە پاڵی داوین کەم کەم ئەم ڕیسالانەی زانایانی دەعوە و تەوحید شیکاری بۆ بکەین و مەبەست و واتاکانی بە زمانی کوردی بخەینە بەر دیدەن و دەستان بۆ ئەوەی هۆشیاربن و هەڵنەخەڵەتێن بە دەمە تەقێی ئەم جەهلستانە و ئەکتەرانی , تێبێنی ئەم باسە هەر لە سەردەمی شێخی ئیسلام محمدی کوڕی عبدالوهاب بەڕەحمەت بێت , کۆمەڵێك لە زانایانی ئەو کات ئەم باسەیان لێ تێکەڵ بوو هەر لەوکاتەوە زانایانی دەعوە بە سەرۆکایەتی شێخ محمد وەڵامی ئەم گومانانەیان داوەتەوە کە پێش سەردەمی ئەوان ئەم گومانە بوونی نەبووە بەڵکو لەسەردەمی شێخەوە سەری هەڵدا لە ئەنجامی نا حاڵی بوونی کۆمەڵێك دەقی شێخی ئیسلام ئیبنو و تەیمیە و قوتابیانی لە لایەن ئەم زانایانەوە سەر ئەنجام ئەم بیدعە و فیتنەی (** عذر بالجهل **) لەناو شیرك و کوفردا سەری هەڵدا ئەنجام و بەرهەمەکەی تێکەڵ ئاسان بوونی شیرك و کوفر بوو بۆیە من پێشتر لە وەرگێڕانی ڕیسالەی (** المتممة لكلام أئمة الدعوة في مسألة الجهل في الشرك الأكبر **) لە ئامادەکردنی شێخ علی خوزەیر الله تعالی ئازادی بکات باسی سەر هەڵدانی ئەم گومانەی (**عذر بالجهل**)م کردووە لە لاپەڕە (١٨) .**

**بۆیه منیش له ناوەڕاستی خوێندنەوەی کتێبی (** مجموع فتاوى ورسائل الشيخ العلامة عبدالله بن عبدالرحمن أبا بُطَين النجدي **) چاوم بەم ڕیساله و فەتوای شێخ کەوت سوودم لێی بینی حەزم کرد ئێوەش ئاشنا بن بەم ڕیسالەیە وە هەروەها له کتێبی (** الدرر السنية في الأجوبة النجدية **) له کتاب (** تابع حكم المرتد **) له بەرگ و پەڕاوی :** ٣٥٩/١٠ **هاتووە وە ناوم لێناوە (** الرسالة في عدم العذر بالجهل **) که تێیدا به بەڵگەی قورئان و سوونەت دەسەلمێنێت نەزانین عوزر نیه بۆ کەسانێك کە کوفر و شیرك دەکەن , وە تێیدا چەند وتەیەکی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیه کە گومانی لەسەر درووست بووە ڕوون دەکاتەوە , وە خۆشم بە کۆمەڵێك تەعلیقی پڕسوود لە ژێرەوە بەژداریم کردووە بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەم ڕیسالەیە بۆ ئەوەی بە هەڵە نەچین لە دەستەواژەکانی شێخی ئیسلام و دوای ئەوان , بۆیە داواکارم لە الله تعالی ئەم ڕیسالەیەش ببێتە هۆکاری سوود بۆ خوێنەران و یەك خوا پەرستان , وە بیخاتە توێشووی قیامەتی سەخت و بەهەشتەکەشی بکاتە جێگا و ڕێگامان ..اللهم أمين يارب**

**براتان**

**هاوکار کوردی**

**ڕێکەوتی : 4 – 6 – 1441 کۆچی بەرامبەر 1 – 2 – 2020 عیسایی**

**هەولێر - کوردستانی باشوور - عێراق**

متن

(الوقوع في بعض المكفرات جهلا)
وسئل الشيخ عبد الله بن عبد الرحمن أبا بطين، رحمه الله: عمن ارتكب شيئا من المكفرات جهلا، يكفر إذا كان جاهلا بكون ما ارتكبه كفر، أم لا؟

**شیکردنەوە :**

**(کەوتنە ناو هەندێك لە کوفر بەهۆی نەزانینەوە )**

**پرسیارکرا [٣] لە موفتی و عەلامەی وڵاتی نەجد شێخ عبداللە کوڕی عبدالرحمن ئەبا بوتەین گۆڕەکەی پڕنوور بێت و ڕەحمەتی الله تعالی بەسەریا بێت دەربارەی : کەسانێك کە دەکەونە ناو کوفر بەهۆی نەزانینەوە ئایا کافر دەکرێت بەهۆی ئەوەی کە کەوتۆتە ناو کوفرەوە یاخود نا ؟**

---

(٣)ئەوکەسەی ئەو پرسیارەی لە شێخ کرد : عبدالعزیزی کوڕی عیبان بوو کە لە سەدەی سێزدەبوو کە دەکاتە نزیکەی ساڵی ( ١٢٧٠ کۆچی ) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ژیانی سەیری کتێبی ( التقويم بين الماضي والحاضر ) لاپەڕە : ١٦٨ .

متن

فأجاب الشيخ :
بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ
قال تعالى: {إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُدَ زَبُوراً وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيماً رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزاً حَكِيماً} فلا عذر لأحد بعد بعثة محمد صلى الله عليه وسلم في عدم الإيمان به وبما جاء به، بكونه لم يفهم حجج الله وبيناته لأن الله سبحانه أخبر عن الكفار بعدم الفهم

**شيكردنەوە :**

**بەناوی الله تعالی بەخشەندەی میهرەبان**

**الله تعالی دەفەرموویێت ( واتە : ئەی محمد صلی الله علیه وسلم ئێمە نیگامان بۆتۆکرد وە بۆ پێش تۆش لە پێغەمبەر نوح علیه السلام وە بۆ ئەو پێغەمبەرانەی پاش ئەویش هاتوون وە نیگامان بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانیان وە بۆ پێغەمبەر عیسا و ئەیوب و یونس و هارون و سولەیمان وە هەروەها زەبورمان دا بە پێغەمبەر داود سڵاوی الله لە گشتیان بێت , هەندێك لە پێغەمبەران ناو و چیرۆکمانیان گێڕاوەتەوە بۆت لە پێشەوە وە هەندێك پێغەمبەرانیش ناو و چیرۆکمان باس نەکردوون بەسەرتا , وە الله تعالی قسەی لەگەڵ موسا کردووە , ئەم پێغەمەرانە گشتیان نێردراون بۆ ئەوەی بۆ هەندێك خەڵك ببن بە موژدەدر وە بۆ هەندێکیش ترسێنەر بۆ ئەوەی کە ببن بە بەڵگە و دەلیل لە پاش نەمانی پێغەمبەران و عەهدی ڕیسالە بەڕاستی الله تعالی خاوەن عیزەت و دانابیە )** سورة : النساء أية:١٦٣ - ١٦٤

**بۆیە هیچ عوزر و بیانووەك نەماوە لە پاش هاتنی پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم لە نەبوونی ئیمان پێ هێنان پێی وە ئیمان نەبوون بەوەی کە پێی نێردراوە کە ئیسلام و قورئانە بە بیانووی ئەوەی تێناگەن لە بەڵگە و دەقەکانی قورئان و سوونەت , لەبەر ئەوە عوزر و بیانوو نیە چونکە گەر سەیر بکەیت الله تعالی لە قورئان هەواڵی داوە بە تێنەگەیشتنی کافرەکان**

**له بەڵگەکان کەچی هەر بە موشریك و کافر ناوی هێناون , وە نەزانین و تێنەگەیشتنی نەکردۆتە عوزربۆیان .**

فقال تعالى: {وَجَعَلْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْراً} وقال: {إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ} وقال: {صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَعْقِلُونَ} والآيات في وصفهم بغاية الجهل، كثيرة معلومة، فلم يعذرهم تعالى بكونهم لم يفهموا، بل صرح بتكفير هذا الجنس، وأنهم من أهل النار، كما في قوله تعالى: {قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً} وقوله: {وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ}

**شیکردنەوە :**

**وەك الله تعالى دەفەرموویت ( واتە : چەند بەرگی پەردەیەك لەسەر دڵیان دادەنێین تا لە ئایەتەکانی ئێمە تێنەگەن وە قورسایی و گرانی دەخەینە گوێیانەوە بۆ ئەوەی حەق نەبیستن چونکە خۆیان نایانەوێت بیبیستن پەروەردگاریش بە زۆر پێیان نابیستێ )** الإسراء : أية ٤٨.

**وە الله تعالى لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت ( واتە : الله تعالى دەستەیەکی لە خەڵك ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگای ڕاست و درووست وە دەستەیەکی تریشی بەهۆی کار و کردەوەی خۆیانەوە گومڕایی بوونی بەسەر چەسپاندن چوونکە ئەوان لە جیاتی الله تعالى شەیتانیان کردە یاریدەر و دۆستی خۆیان وە واشیان دەزانی لەسەر ڕێگای حەق و هیدایەتن )** [٤] الأعراف : اية ٣٠.

(٤) **ئیمامی تەبەری لە تەفسیرەکەیدا لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت** (إن الفريق الذي حق عليهم الضلالة، إنما ضلوا عن سبيل الله وجاروا عن قصد المحجة، باتخاذهم الشياطين نُصراء من دون الله، وظُهراء، جهلا منهم بخطأ ما هم عليه من ذلك، بل فعلوا ذلك وهم يظنون أنهم على هدى وحق، وأن الصواب ما أتوه وركبوا) **واتە : ئەو دەستە و کۆمەڵەی کە الله تعالى گومڕایی بەسەر چەسپاندن هۆکارەکەی ئەوەبوو گومڕابوون لەسەر ڕاستە ڕێگای الله تعالى وا گومانیشیان دەبرد کە لەسەر مەبەست و ئامانجی شەرع و شەریعەتن و لەسەر ڕاستین ,بەوەی کە شەیتانەکانیان لە جنۆکە و مرۆڤەکان کردبووە دۆست و یاریدەر لە غەیری الله تعالى وە پشتیوانکار بە هۆی نەزانینیانەوە بە هەڵەیی لەسەری بوونە , ئەم کارەیان دەکرد وە واش گومانیان دەبرد کە لەسەر ڕێنمایی و حەقن وە ڕاست و پێکاو ئەوەیە کە بۆیی هاتوون.**

**الله تعالى دەفەرمووێت ( واتە : ئەوانە لە دوو ڕوو و کافرەکان چونکە حەق نابیستن و وشەی ڕاست بە زاریاندا نایە , لە حەقیش ترووسکایی ناکەن کەڕ و لال و کوێرن لە ئاست حەق وە هەرگیزیش ژیر نابنەوە )**البقرة : أية : ١٧١.

والآيات في وصفهم بغاية الجهل، كثيرة معلومة، فلم يعذرهم تعالى بكونهم لم يفهموا، بل صرح بتكفير هذا الجنس، وأنهم من أهل النار.

**واتە : ئەم ئایەتانە وەسفی کەسانێك دەکات بەوپەڕی نەزانینەوە لەگەڵ ئەوەشدا زانیاریان زۆرە بەڵام الله تعالى عوزر و بیانووی نەزانینی بۆ نەهێنانەوە لەبەر ئەوەی لە بەڵگەکان تێنەگەیشتوون بەڵکو بە صەریحی کافری کردوون ئەم ڕەگەزە نەزانە وە جێگا و کۆتایان دۆزەخە بە بەردەوامی** [٥]

---

**[٥]کەواتە لێرە جیاوازی لە نێوان ( إقامة الحجة ) و ( فهم الحجة ) هەیە , واتە : کەسێك کە شیرك ئەنجام دەدات یان دەکەوێتە ناو کردەوەیەکی شیرکی گەورە ئەوە پێش ئیقامە حوجە هەرپێی دەوترێت موشریك تەنها بە تێکەوتنی شیرك موشریك دەبێت بەڵام ( مشرك غير معذب ) بۆیە ئیقامە حوجەی دەکرێت وەك شێخی ئیسلام ئیبن و تەیمیە و قوتابیەکەی ئیبن قەیم و شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب و نەوە و قوتابیانی وا دەفەرموون واتە بەڵگەی بۆ دەبەیت کە ئەوە شیرکە کە تۆ ئەنجامی دەدەیت , هەر موشریکە و ناوی بە موشریك دەبەیت بە ( مشرك غير معذب ) ئەگەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ تەوحید و تەسلیم بوو ئەوە ئەوکات ناوی موسڵمانی لێ دەنرێت بەڵام نکۆڵی لێکرد و دەستی هەڵنەگرت ئەوە پێویست ناکات لە ( فهم الحجة ) تێبگات واتە : لە بەڵگە تێبگات ئینجا موشریکی بکەیت , نا دوای ئیقامە حوجە واتە : بەڵگە بۆ بردن ئینکاری کرد ئەوە پێی دەڵێین ( مشرك كافر معذب ) موشریکی کافر**

**وەك الله تعالى لە سورەی الكهف دەفەرموویت ( واتە : بلێ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم بەو خەڵكە ئایا پێتان بڵێم دۆڕاوترین کەس لای الله تعالى كێیە ؟ ئەوانەن کە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان لەم ژیانی دونیایەدا بێ ناوەڕۆك دەرچوو , چونکە بێ باوڕبوون و هەرچیشیان كردبێت لێیان وەرنەگیراوە لەگەڵ ئەوەشدا لایان وایە كارێكی شیاو و شایستەیان ئەنجامداوە خۆیان نەزان كرد کە : ڕەوشت چاکی لەگەڵ كوفر کەڵكی نابێت [٦] ئەوانە کەسانێكن کە بە ئایەتەکانی الله تعالى و دیداری لە قیامەت كافربوون ئینجا لەبەر ئەوە كردەوەكانیان پوچەڵ بۆیەوە وە لە قیامەت هیـچ ڕێز و سەنگێكیان نابێت لە تەرازووی الله تعالى )** [٧] الكهف : اية : ١٠٣ و ١٠٤ و١٠٥

**وە لە شوێنێكی تردا الله تعالى دەفەرموویت ( واتە : لە ئەسڵدا خەڵكی دۆزەخ دیاری كراون لە زوویەوە لە جنۆكە و ئادەمیمان بۆ دۆزەخ بەدی هێنا , چوونكە لە ئەنجامدا بە ئارەزووی خۆیان ڕێگای بەدبەختی خۆیان دەگرنە بەر واتە : بەرلەوە درووست بكرێن دەمانزانی كێ چاكە دەكات و كێش خراپەكار , بۆیە ئێمەش بڕیاری واماندا , دڵیان هەیە كەچی دەسەڵاتی الله پێی نابینن , هەستی بیستنیان هەیە بەڵام پێی نابیستن , ئەوانە وەك ئاژەڵ و مەڕ و بزن و وشتر و گان بەڵكو ئەوان لە ئاژەڵیش وێڵترن , چوونكە ئاژەڵ دەگەڕێ لە شوێن و سوود و كەلكی خۆی , وە لە زیان و زەرەری خۆی ڕادەكات , ئەوانە بێ ئاگان لە ئایەتەكانمان )** الأعراف أية : ١٧٩ .

---

**(٦ )ئیمامی تەبەری لە تەفسیرەكەیدا لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموویت ( ئەمە هەڕەشەیە بۆ تەواوی خەڵكانی ئەهلی بیدەع وە گشت باوڕە پوچەكان دەگرێتەوە ) سەرچاوە (جامع البيان في تأويل القرآن) لە بەرگ و پەڕگوڵاوی :** ١٨ / ١٢٧

**(٧)ئەبو هوڕەیرە دەفەرموویت : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت** (إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ العَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ القِيَامَةِ، لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَقَالَ: اقْرَءُوا : فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ القِيَامَةِ وَزْنًا ) **واتە : لە ڕۆژی قیامەت پیاوێكی گەورە و قەڵەو دەهێنن لای پەروەردگار بە قەی پەڕەی مێشێك قورسایی و سەنگی نیە . دواتر ئەم ئایەتی خوێندەوە** (فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً ) **صحيح البخاری بە ژمارە :** ٤٧٢٩ **وە صحيح مسلم بە ژمارە :** ٢٧٨٥

متن

قال الشيخ أبو محمد المقدسي، لما انجر كلامه في مسألة: هل كل مجتهد مصيب، أم لا؟ورجح ما هو الحق في ذلك، وهو: أنه ليس كل مجتهد مصيبا، بل الحق في قول واحد من أقوال المجتهدين; قال: وزعم الجاحظ أن مخالف ملة الإسلام، إذا نظر فعجز عن إدراك الحق، فهو معذور غير آثم، - إلى أن قال: وأما ما ذهب إليه الجاحظ، فباطل يقينا، وكفر بالله، ورد عليه وعلى رسوله.

**شيكردنەوە :**

**شێخ باوكی محمدی مەقدیسی ڕەحمەتی الله لێبێت كاتێ قسە لەسەر بابەتێك دەكات دەفەرمووێت : ئایە هەموو موجتەهیدێك تێیدا دەی پێكێت یان نا ؟ وە كامە ڕاست و درووست و تەرجیح كراوە لەم باسە ؟ ئەو باسە دەكات تێیدا دەفەرمووێت : مەرج نیە هەموو موجتەهیدێك حەق بپێكێت , بەڵكو حەق لە وتەی یەكێك لە موجتەهیدەكاندایە وە دەفەرمووێت : جاحز وا گومانی برد ئەوەی پێچەوانەی میلەتی ئیسلام دەكات واتە : كوفرێك دەكات ئەگەر سەیری بكات ئەوە دەستەوەسان دەبێت لە دەرك كردنی حەق و ڕاستی ئەوە عوزی قەبوڵە و تاوانبار نیە , تاوەكو قسەی شێخ باوكی محمد دەگاتە ئەوەی كە دەفەرمووێت : ئەوەی جاحز بۆی چووە ئەوە بە دڵنیایەكی تەواو باتڵ و پوچە , وە كوفرە بە الله تعالی , وە هەڵگەڕانەوەیە لە الله تعالی و پێغەمبەرەكەی صلی الله علیه وسلم .**

فإنا نعلم قطعا: أن النبي صلى الله عليه وسلم أمر اليهود والنصارى بالإسلام واتباعه، وذمهم على إصرارهم، وقاتل جميعهم، وقتل البالغ منهم، ونعلم أن المعاند العارف مما يقل، وإنما الأكثر مقلدة، اعتقدوا دين آبائهم تقليدا، ولم يعرفوا معجزة الرسول صلى الله عليه وسلم وصدقه.قال: والآيات الدالة على هذا كثيرة من القرآن، كقوله تعالى: {ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ} {وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنْتُمْ بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ مِنَ الْخَاسِرِينَ} {وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ} وقوله: {وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ} {وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ} {الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً} وفي الجملة: ذم المكذبين لرسوله صلى الله عليه وسلم مما لا ينحصر في الكتاب والسنة، انتهى كلامه رحمه الله

**شیکردنەوە :**

**ئێمە بە قەتعی دەزانین کە : پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرمانی کرد بە یەهودیەکان و گاورەکان کە موسڵمان بن و بە دوای یاسا و ڕێچکەی ئیسلام بکەون , وە سەرزنشت و برینداری دەکردن لەسەر سووربوونیان لەسەر کوفر و شیرك . وە کوشتاری هەمووی کرد و تازە باڵغ بووەکانی لە پیاوان کوشتاری دەکردن , وە دەزانین کەسە عینادەکان لە زانا و ئاخوندەکانیان کەم بوون , بەڵکو زۆرینەی موقەلید بوون تەنها بە دوایان کەوتبوون و هیچیان نەدەزانی چوونکە زاناکانیان ڕاستی و حەقیقەتی پەیامی پێغەمبەر و صلی اللە علیە وسلم و ئیسلامیان لە خەڵکە عەوام و نەزانەکە شاردبۆیەوە , تەنها وەك عورف و شوێن کەوتەی باو وباپیرانیان لەسەر دینەکەیان مابوونەوە , هیچیان لەبارەی موعجیزە و ڕاستگۆیی پێغەمبەری صلی اللە علیە وسلم نەدەزانی , ئایەت بۆ بەڵگەبوون لەسەر ئەم باسە لە قورئان زۆرە وەك اللە تعالی دەفەرموویێت ( واتە : کافران و بێ باوڕان باوڕیان وابوو کە بێ هودە درووستکراون , سزا و تیاچوون بۆ بێ باوڕان لەناو ئاگری دۆزەخدا ) ص : ٢٧ وە لە شوێنی تردا دەفەرموویێت ( واتە : هەر ئەو گومانەتان بوو , بەرامبەر بە پەروەردگارتان لە ناوی بردن و تیاچوون وە لە دۆڕا و زیان بووەکانیشی گێڕان خۆتان و دەوروبەرەکەشتان فەوتاند ) فصلت :٢٣.**

**وە لە شوێنی تردا دەفەرموویێت ( واتە : هەر لەناو خەیاڵ و گوماندا دەژین واتە : لای الله تعالی زانا و نەزانی ئەهلی کیتاب یەکسانن لە سزا و عەزاب )** البقرة : ٧٨. **وە لە شوێنی تردا دەفەرموویێت ( واتە : ڕۆژێك الله تعالی هەموویان زیندوو دەکاتەوە ئەوسا سوێند دەخۆن بۆ الله تعالی کە ئەهلی ئیمان بوون , وەك ئێستا کە سوێند بۆ ئێوە دەخۆن , واش دەزانن شتێك لە باریاندایە بەو سوێندە , هۆشیاربن بەڕاستی ئەوان لە ڕیزی درۆزنەکاندا بوون )** المجادلة : ١٨ . **وە لە شوێنی تردا دەفەرموویێت ( واتە : ئەم کافرانە وا گومانیان دەبرد لە هیدایەت دراوان بن )** الزخرف : ٣٠ **.وە لە شوێنی تردا دەفەرموویێت ( واتە : بڵێ ئەی محمد صلی الله علیه وسلم بەو خەڵکە ئایا پێتان بڵێم دۆڕاوترین کەس لای الله تعالی کێیە ؟ ئەوانەن کە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان لەم ژیانی دونیایەدا بێ ناوەڕۆك دەرچوو , چونکە بێ باوڕبوون و هەرچیشیان کردبێت لێیان وەرنەگیراوە لەگەڵ ئەوەشدا لایان وایە کارێکی شیاو و شایستەیان ئەنجامداوە خۆیان نەزان کرد کە : ڕەوشت چاکی لەگەڵ کوفر کەڵکی نابێت ئەوانە کەسانێکن کە بە ئایەتەکانی الله تعالی و دیداری لە قیامەت کافربوون ئینجا لەبەر ئەوە کردەوەکانیان پوچەڵ بۆیەوە وە لە قیامەت هیچ ڕێز و سەنگێکیان نابێت لە تەرازووی الله تعالی)**

**پوختەی قسە ئەوەیە : زەم کردنی الله تعالی بۆ ئەوکەسانەی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم بە درۆ زانیوە لە قورئان و سوننەت زۆری باس کردووە ناتوانین گشتی بەڵگەکان لێرە کۆبکەینەوە.**

فبين رحمه الله: أنا لو لم نكفر إلا العارف المعاند، لزمنا أن لا نكفر اليهود والنصارى، وهذا من أبطل الباطل.

**شیکردنەوە :**

**شێخ باوکی محمد مقدیسی ڕەحمەتی پەروەردگاری لێبێت ئەوە ڕوون دەکاتەوە دەفەرموویێت : ئەگەر ئێمە کەسمان کافر نەکرد ئیلا کەسانێکی زانای ئینکار واتە : جاهیل و نەزانە شوێن کەوتووەکانمان لەگەڵ ئەوان کافر نەکرد ئەوە ئەوکات پەیوەست دەبین بەوەی کە عەوامی خەڵکی یەهودی و گاورەکان کافر نەکەین ئەوەش بەڕاستی لە پوچترینی پوچەکانە.**

## شیکردنەوەی وتەی ئیبنو تەیمیە

وأما قول الشيخ رحمه الله، لما ذكر شيئا من أنواع الشرك الحادث في هذه الأمة قال: لكن لغلبة الجهل، وقلة العلم بآثار الرسالة في كثير من المتأخرين، لم يمكن تكفيرهم بذلك حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم، لم يقل: حتى يتبين، فتحقق منهم العناد بعد المعرفة.قال رحمه الله في بعض كتبه، لما ذكر بعض ما يفعله كثير من الكفار، والخروج بذلك عن الإسلام، قال: وهذا كثير غالب، لا سيما في الأعصار والأمصار، التي تغلب فيها الجاهلية والكفر والنفاق؛ فلهؤلاء من عجائب الجهل، والظلم، والكذب، والنفاق، والضلال، ما لا يتسع لذكره المقام.

**شیکردنەوە :**

**هەروەها وتەی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە کاتێ باسی شتانێك لە جۆرەکانی شیرکی نوێ دەکات کە تێکەڵی ئەم ئومەتە بووە دەفەرمووێت [٨] : لەبەر زاڵ بوونی جەهل و نەزانین وە کەمی زانست بە شوێنەواری ڕیسالە لە زۆرینەی دواکەوتووەکانی ئوومەت ناگونجێت تەکفیرکردنیان بەهۆی ئەوەوە تاوەکو ئەوەیان بۆ ڕوون نەکرێتەوە [٩] کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆی هاتووە کە ئیسلام و شەریعەتە .**

---

(٨)سەیری کتێبی ( الرد علی البکری ) بکە لە پەڕگوڵاوی : ٧٣١.

(٩) جوان دیقەت بدە و لە قسەی شێخ تێبگە وا گومان نەبەیت کە شێخ عوزری دابێت بە جاهیل بەهۆی زاڵ بوونی جەهل مەبەستی شێخ ئەوەیە : بۆ یان ببات مەبەست لە ئیقامە حوجەیە بۆ کەسانێکی موشریك بەڵام موشریکێکی ( غير معذب ) بۆیە موشریکی ( غير معذب ) ناتوانرێت تەکفیری بکەیت تاوەکو ئیقامە حوجەی بۆ دەکرێت شێخ لێرە جیاوازی دەکات لە ( لحوق اسم کفر و اسم شرك ) ئەو کەسەی کە کەوتۆتە ناو شیرکەوە موشریك دەبێت بەڵام تەکفیرکردنی نا تاوەکو ئیقامە حوجەی بۆ دەبەیت و ڕیسالەی بۆ ڕوون دەکەیتەوە ئەگەر تەسلیم بوو ئەوە موسڵمانە ( لحقوق اسم مسلم ) دەچێتەوە سەری بەڵام ئینکاری کرد ئەوە ئەوکات موشریکی کافرە ( معذب ) وەك شێخی ئیسلام لە ڕیسالەکانی ئەم مەنهەجەی بە ڕوونی دیارە . وشەی (حتى يبين لهم) واتە : بردنی ئیقامە حوجە بۆیان نەوەك مەبەست لێی (حتى نفهم من الرسالة ).

**ڕوونکرنەوەی ئەم وتەیە :**

**شێخ ئیبنو تەیمیە نەی فەرمووە : (حتى يتبين) واتە : تاوەکو بۆی ڕوون دەکەیتەوە بەڵکو فەرمووی (حتى يبين لهم)مەبەست لە ڕوون کردنەوە بردنی ئیقامە حوجەیە بۆیان شێخ نەوەستاوە لەسەر ئەوەی کە تێدەگەن یان نا بۆیەش ئیقامە حوجەی کردن تەنها بۆ ئەوەیە ببێتە بەڵگە بۆیان لە ( مشرك غير معذب ) دەرچن .ئەوەش دێتەجێ لە کەسی عیناد لە پاش زانینی .**

**شێخ ئیبنو تەیمیە ڕحمەتی پەروەردگاری لێبێت لە هەندێك لە کتێب و ڕیسالەکانی کاتێ باسی هەندێك لە کردەوەی زۆرینەی کافرەکان دەکات و باسیان دەکات بەهۆی ئەم کوفرانەوە دەرچوونە لە ئیسلام شێخ دەفەرموویت [١٠]: ئەوە زۆرینەیەکی زاڵە کە کافر بوونەتەوە [١١] بەتایبەت لەو سەردەم و وڵاتانەی کە جاهلیەت و نەزانی و کوفر و نیفاق تێیدا زاڵ بووە , بۆ ئەوانەی لە سەیرترینی جەهل و ستەم و درۆ و کوفر و نیفاق و گومڕاییە , پێویست بە درێژی قسەکردن ناکات لەم باسە ئەوەندە بەسە بۆ ئێرە.**

---

**(١٠) بڕوانە ( مجموع الفتاوى ) لە بەرگ و پەڕگوڵاوی : ١٨/٥٨.**

**(١١) ئەم وتەی شێخ تەفسیری وتەکەی ترە کە لە پێشەوە باسمان کرد** (لكن لغلبة الجهل، وقلة العلم بآثار الرسالة في كثير من المتأخرين، لم يمكن تكفيرهم بذلك حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم) **تەکفیرنەکردنی شێخ لەوێ تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئیقامە حوجە نەکراون نەوەك بەهۆی زاڵ بوونی جەهل و نەزانین و کەمی زانست . ئەم کەمی زانست و جەهلە تەنها لەنەبوونی ئیقامە حوجەیە کە هیچ کات بۆیان نەهاتووە جا لەبەر دوورە دەستی وڵتیان یان نەگەیشتنی ڕیسالە بۆیان یان لە وڵاتی کوفرن دوورن لەو شتانە , تەبعا ئەوە بۆ سەردەمێکە کە هیچ ئالەتێکی گواستنەوە وەك : ئینتەرنێت و تەکنەلوجیا و هتد نەبووە بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمڕو هیچ عوزرێك بۆ هیچ کەسێك نەماوە شوێن و ماڵ و سوچ نیە ئەم ڕیسالەی بۆ نەچووبێت, کەواتە وتەی شێخ لە هەردوو لا بە ڕوونی دیارە .**

**جیاوازی لە نێوان (المقالات الخفية ) و (الأمور الظاهرة ) لە تەکفیرکردندا**

وإذا كان في المقالات الخفية
فقد يقال فيها إنه مخطئ ضال، لم تقم عليه الحجة التي يكفر صاحبها؛ لكن ذلك يقع من طوائف منهم، في الأحوال الظاهرة التي يعلم الخاصة والعامة من المسلمين، أنها من دين الإسلام بل اليهود والنصارى، والمشركون، يعلمون أن محمدا صلى الله عليه وسلم بعث بها، وكفر من خالفها، مثل أمره بعبادة الله وحده لا شريك له، ونهيه عن عبادة أحد سوى الله، من الملائكة، والنبيين أو غيرهم؛ فإن هذا أظهر شعائر الإسلام، ومثل هذا: معاداة اليهود والنصارى والمشركين، ومثل تحريم الفواحش، والربا والخمر والميسر، ونحو ذلك ثم تجد كثيرا من رؤوسهم وقعوا في هذه الأنواع، فكانوا مرتدين، وإن كانوا قد يتوبون من ذلك أو يعودون

**شیکردنەوە :**

**ئەگەر هاتوو کوفرەکە لە وتە شارەوەکان بوو ئەوە تەنها پێی دەڵێت : إنه مخطئ ضال واتە : هەڵەکارێکی گومڕایە, ئیقامە حوجەی نەکراوە لەو شتەی کە خاوەنەکەی کافر دەکاتەوە بەڵام تەکفیرکردن ڕوودەدات لەو کۆمەڵەی کە لە باسە ئاشکراکان تێدەکەون لەو باسە ئاشکرایانەی کە عام و خاصی خەڵك لە موسڵمانان دەزانن کە کوفرە ئەوە لە دینی ئیسلام یەهود و گاورەکان و موشریکەکان دەیانزانی کە پێغەمبەر محمد صلی الله علیه وسلم بۆیان نێردراوە وە کافرە ئەوەی پێچەوانەی بکات وەك فەرمانەکان پێیان کە : فەرمانی پێ کردن عیبادەتی الله تعالی بکەن بە تەنها وە ڕێگری لێکردن لە عیبادەت کردنی غەیری الله تعالی نمونە لە : فریشتەکان و پێغەمبەران و جگە لەوانیش , ئەوە بەڕاستی لە ئاشکراترینی سیمای ئیسلامە وە نمونەی ئەوە : دژایەتی کردنی یەهودی و گاورەکان و موشریکین وە نمونەی : حەڕام کردنی خراپەکاری و سوو خواردن و مەشڕوب خواردن و قومارکردن , هاوشێوەی ئەوانە لە پاشان دەبینی زۆرێك لە گەورەکانیان کەوتوونەتە ناو ئەم جۆرانەی کە باسمان کرد , ئەوانە گشتیان هەڵگەڕاوەن ئەگەرچی تەوبەش لەوە بکەن یان بگەڕێنەوە لێی [(١٢)]**

---

**(١٢) شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە دەفەرموێت (ولهذا يكفر جاحد الأحكام الظاهرة المجمع عليها وإن كان عاميا، دون الخفية) واتە : بۆیە ئەوکسانە کافر دەکەین کە نکۆڵی لە ئەحکامە ئاشکراکان دەکەن کە ئیجماعی لەسەرە ئەگەر عەوامی خەڵکیش بێت ( واتە : نەوان و جاهیل ) جگە لە باسە شاراوەکان . سەرچاوە ( المستدرك على مجموع الفتاوى ) بەرگ و پەڕاوی : ٢٥٤/٢. =**

.................................................................................................................................................

= وه شێخ له شوێنێکی تردا دەفەرموویت (وَمَنْ جَحَدَ وُجُوبَ بَعْضِ الْوَاجِبَاتِ الظَّاهِرَةِ الْمُتَوَاتِرَةِ: كَالصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ وَصِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ وَحَجِّ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ أَوْ جَحَدَ تَحْرِيمَ بَعْضِ الْمُحَرَّمَاتِ الظَّاهِرَةِ الْمُتَوَاتِرَةِ: كَالْفَوَاحِشِ وَالظُّلْمِ وَالْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَالزِّنَا وَغَيْرِ ذَلِكَ. أَوْ جَحَدَ حِلَّ بَعْضِ الْمُبَاحَاتِ الظَّاهِرَةِ الْمُتَوَاتِرَةِ: كَالْخُبْزِ وَاللَّحْمِ وَالنِّكَاحِ. فَهُوَ كَافِرٌ مُرْتَدٌّ يُسْتَتَابُ فَإِنْ تَابَ وَإِلَّا قُتِلَ وَإِنْ أَضْمَرَ ذَلِكَ كَانَ زِنْدِيقًا مُنَافِقًا لَا يُسْتَتَابُ عِنْدَ أَكْثَرِ الْعُلَمَاءِ؛ بَلْ يُقْتَلُ بِلَا اسْتِتَابَةٍ إذَا ظَهَرَ ذَلِكَ مِنْهُ) واته : هەرکەسێ نکۆڵی له واجب بوونی هەندێك له واجباته ئاشکرا موتەواترەکان بکات وەك : پێنج نوێژه فەرزەکان و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و حەجی ماڵی کۆنی الله تعالی , یان ئینکاری له حەرام کردنی هەندێك له حەرام کراوه ئاشکرا و دیار و موتەواترەکان بکات وەك : خراپەکاری و زوڵم و مەشروب و قومار و داوێن پیسی و جگه لەوانەش , یان ئینکاری کردنی هەندێك له حەلال کراوه ئاشکرا و موتەواترەکانی وەك : نان و گۆشت و نیکاح بکات ئەوه کافر و مورتەده داوای تەوبەی لێدەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەرنا دەکوژرێت له ملی دەدرێت وه ئەگەر ئەم دژایەتی و ئینکاری کردنەی شاردەوه به دڵ بیکات ئەوه زەندیق و مونافیقه داوای تەوبەی لێناکرێت لای زۆرینەی زانایان بەڵکو دەکوژرێت بەبێ وەرگرتنی تەوبه لێی ئەگەر ئەوەی لێ بینرا , سەرچاوه ( مجموع الفتاوى ) بەرگ و پەڕاوی : ٤٠٥/١١ .

وه شێخ له شوێنێکی تردا دەفەرموویت (وَلِهَذَا اتَّفَقَ الْأَئِمَّةُ عَلَى أَنَّ مَنْ نَشَأَ بِبَادِيَةٍ بَعِيدَةٍ عَنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَالْإِيمَانِ وَكَانَ حَدِيثَ الْعَهْدِ بِالْإِسْلَامِ فَأَنْكَرَ شَيْئًا مِنْ هَذِهِ الْأَحْكَامِ الظَّاهِرَةِ الْمُتَوَاتِرَةِ فَإِنَّهُ لَا يُحْكَمُ بِكُفْرِهِ حَتَّى يَعْرِفَ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ؛ وَلِهَذَا جَاءَ فِي الْحَدِيثِ {يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَا يَعْرِفُونَ فِيهِ صَلَاةً وَلَا زَكَاةً وَلَا صَوْمًا وَلَا حَجًّا إلَّا الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْعَجُوزُ الْكَبِيرَةُ يَقُولُ أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا وَهُمْ يَقُولُونَ: لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَهُمْ لَا يَدْرُونَ صَلَاةً وَلَا زَكَاةً وَلَا حَجًّ. فَقَالَ: وَلَا صَوْمَ يُنْجِيهِمْ مِنْ النَّار ) واته : لەبەر ئەوەیه زانایانی گەورەی ئوومەت یەك دەنگن لەسەر ئەوەی گەر کەسێك له شوێنێکی دووره دەست دوور له ئەهلی عیلم و ئیمان بژین وه دووربن له سەردەمی ئیسلام واته : ئەهلی فەتره بن , نکۆڵی له شتێکی ئەحکامه ئاشکرا موتەواترەکان بکات ئەوه حوکمی لەسەر نادرێت به کافر بەڵام تیبینیەك ( هەر پێیان دەوترێت موشریك بەڵام موشریکی غیر معذب ئەوه له مەنهەجی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیەیه ) تاوەکو ئەوه نەزانن که بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هاتووه ( ئیقامه حوجه ) لەبەر ئەوەیه له فەرمووده هاتووه که پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویت : سەردەمێك بەسەر خەڵکدا دێت نه دەزانن نوێژ چیه نه زەکات نه ڕۆژی نه حەج ئیلا ڕیش سپی و بەساڵاچووەکان نەبێت , دەڵێن : گەیشتین به باو و باپیرانمان دەیان ووت : لا اله الا الله بەڵام نەیان دەزانی نوێژ و زەکات و حەج چیه وه نه ڕۆژووەك هەیه له ئاگر ڕزگارت بکات . سەرچاوه (جامع المسائل لابن تيمية) بەرگ و پەڕاوی : ١٥١/٣.

وه پرسیار له شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیه دەکرێت پێی دەڵێن (ما تقول السادة العلماء أئمة الدين -رضي الله عنهم أجمعين- في قومٍ يُعظِّمون المشايخ، بكون أنهم يستغيثون بهم في الشدائد، ويتضرَّعون إليهم، ويزورون قبورَهم ويُقبِّلونها ويتبرَّكون بترابها، ويُوقِدون المصابيح طولَ الليل، ويتخذون لها مواسم يقدمون عليها من البعد يسمونها ليلةَ المَحْيَا، فيجعلونها كالعيد عندهم، وينذرون لها النذور، ويُصلُّون عندها) واته : گەوره زانایان چی دەڵێن دەربارەی کەسانێك شێخ و ملاکان به گەوره دەزانن بەوەی که له کاتی ناخۆشی هاواری لێدەکەن , وه خۆیان بۆ زەلیل دەکەن , وه سەردانی گۆڕەکانیان دەکەن و ماچیان دەکەن و به خۆڵەکەی تەبەڕوك دەکەن , وه به درێژایی شەوەکه گڵۆپ و چرا لەسەر مەرقەدەکانیان هەڵدەکەن وه ڕێو ڕەسمی بۆ ئەنجام دەدەن و وه ناویان لێناوه شەوی زیندووەکان , وەك چەژنێك دەیگێڕن وه نەزر و ئاواتی لا دەخوازن و قوربانی و نوێژی لا دەکەن ؟ ئەویش له وەڵامدا دەڵێت (الحمد لله رب العالمين. من استغاث بميِّتٍ أو غائب من البشر بحيثُ يدعوهُ في الشدائدِ والكُرُبات، ويَطلُب منه قضاءَ الحوائج، فيقول: =

= يا سيِّدي الشيخ فلان! أنا في حسبك وجِوارِك أو يقول عند هجوم العدوِّ عليه: يا سيِّدي فلان! يَستوحِيْه ويَستغيثُ به؟ أو يقول ذلك عند مرضِه وفقرِه وغيرِ ذلك من حاجاتِه-: فإن هذا ضالٌّ جاهلٌ مشركٌ عاصٍ لله باتفاقِ المسلمين، فإنهم متفقون على أن الميت لا يُدعَى ولا يُطلَب منه شيء، سواءٌ كان نبيًّا أو شيخًا أو غيرَ ذلك وهذا الشركُ إذا قامت على الإنسان الحجةُ فيه ولم يَنتهِ، وَجَبَ قتلُه كقتلِ أمثالِه من المشركين، ولم يُدفَنْ في مقابرِ المسلمين، ولم يُصَلَّ عليه. وإمَّا إذا كان جاهلاً لم يَبلُغْه العلمُ، ولم يَعرِفْ حقيقةَ الشركِ الذي قاتلَ عليه النبي - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - المشركين، فإنه لا يُحكَم بكُفْرِه، ولاسِيَّما وقد كَثُر هذا الشركُ في المنتسبين إلى الإسلام، ومن اعتقدَ مثلَ هذا قُربةً وطاعةً فإنه ضَالٌّ باتفاقِ المسلمين، وهو بعد قيامِ الحجة كافر.والواجبُ على المسلمين عمومًا وعلى وُلاةِ الأمور خصوصًا النهيُ عن هذه الأمور، والزَّجْرُ عنها بكلِّ طريق، وعقوبةُ مَن لم ينتهِ عن ذلك العقوبةَ الشرعيةَ، والله أعلم)

**واته : سوپاس و ستايش بۆ پەروەردگاری جيهانيان , هەركەسێ هاوار و هانا بۆ مردووەك يان ئامادەنەبووەك لە مرۆڤەكان بە جۆرێك لە كاتی ناخۆشی و كۆسپەكان وە پێداويستيەكانيان لێ داوا بكەن بڵێن : ئەی گەورەم شێخ فلان من لە پانای تۆدام , يان لەكاتی هێرشی دوژمنان بڵێن : ئەی گەورەم فلان بە هانا و هاوارمانەوە وەرە , يان لەكاتی نەخۆشی و هەژاری جگە لەوەانە لە پێداويستيەكانيان داوا بكەن ئەوە : گومڕا و نەزان و موشريكە لە الله تعالی عاصيە بە يەك دەنگی موسڵمانان , چوونكە لەبەر ئەوەی يەك دەنگن لەسەر ئەوەی مردوو هاواری بۆ ناكرێت و وە هيچ شتێكی لێ داوا ناكرێت , جا ئەو مردووە جياوازی نيە پێغەمبەرێك بێت يان شێخێك يان جگە لەوان ئەوە شيركە ئەگەر هاتوو ئيقامە حوجە كرابێت لەسەر خەڵكانێك بەڵام هەر وازيان نەهێنا لەسەر ئەم شيركە سووربوون ئەوە ئەوكات واجبە بكوژرێت وەك نمونەی موشريكانی هاوشێوەی وە لە گۆڕستانی موسڵمانان ناشاردرێتەوە وە نوێژی لەسەر ناكرێت , بەڵام ئەگەر بێت و نەزان و جاهيل بێت زانست و ئيقامە حوجەيان پێ نەگەيشتبێت وە هيچ لە ڕاستی و حەقيقەتی ئەو شيركەی كە پێغەمبەر صلی الله عليه وسلم لەسەری كوشتاری موشريكانی كرد نازانن , ئەوە حوكمی كافريان بەسەردا نادرێت , بە تايبەت ئەم شيركە لەناو كەسانێك بێت كە پاڵدراون بۆلای ئيسلام , ئەوەی بيروباوڕی وابێت ئەوە نزيك بوونەوە و گوێرايەڵی و تاعەتە ئەوە گومڕايە بە كۆدەنگی زانايان وەپاش ئيقامە حوجە كافرن , وە واجبە لەسەر گشت موسڵمانان وە تايبەت وەلی ئەمری موسڵمانان ڕێگری لەم كارانە بكەن , وە بيان ترسێنن و ئاگاداريان بكەيتەوە بە هەموو ڕێگايەك , وە سزا دابنرێت بۆ ئەكەسەی وازی نەهێنا ...الله اعلم** جامع المسائل لابن تيمية) **بەرگ و پەڕاوی : ٣/١٥١.**

وأبلغ من ذلك: أن منهم من يصنف في دين المشركين، والردة عن الإسلام، كما صنف الرازي كتابه في عبادة الكواكب، وأقام الأدلة على حسن ذلك، ومنفعته، ورغب فيه؛ وهذه ردة عن الإسلام باتفاق المسلمين، وإن كان قد يكون عاد إلى الإسلام، انتهى

**شیكردنەوە :**

**شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە زیاتر لەوە دەفەرمووێت [١٣] : ئەوەی بنووسێت لەسەر ڕێباز و دینی موشریكان و هەڵگەڕاوە لە دینی ئیسلام وەك : ئەبوبكری ڕازی شافعی كتێبێكی لەسەر پەرستنی ئەستێرەكان دانا , وە بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر چاكی ئەم كارە , وە سوودەكانی , وە دڵچوون بۆی , ئەوە هەڵگەڕاوەیە لە ئیسلام بە كۆدەنگی موسڵمانان , ئەگەرچی بگەڕێتەوە بۆ ئیسلامیش.**

**(١٣) بڕوانە ( مجموع الفتاوی ) بەرگ و پەڕاوی : ٥٥/٤.**

فانظر إلى تفريقه بين المقالات الخفية، والأمور الظاهرة , فقال في المقالات الخفية التي هي كفر: قد يقال: إنه فيها مخطئ ضال، لم تقم عليه الحجة التي يكفر صاحبها، ولم يقل ذلك في الأمور الظاهرة؛ بل قال: ثم تجد كثيرا من رؤوسهم وقعوا في هذه الأمور، فكانوا مرتدين، فحكم بردتهم مطلقا، ولم يتوقف في الجاهل.

**شیکردنەوە :**

**سەیربکە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە چۆن جیاوازی لە نێوان وتە شاراوەکان و کارە ئاشکراکانی کردووە , لە وتە شاراوەکان کە کوفرە دەڵێت : هەڵەکارێکی گومڕایە , ئیقامە حوجەی نەکراوە لەوشتەی کە خاوەنەکەی کافر دەکات , بەڵام لە بابەتە ئاشکراکان وای نەفەرمووە , بەڵکو فەرموویەتی : دەبینین زۆرێك لە گەورەکانیان کەوتوونەتە ناو ئەم کوفرە , ئا ئەوانە هەڵگەڕاوەن لە دینی الله تعالی , حوکم بە هەڵگەڕاوەیی بە گشتی بەسەریان دەدرێت , ناوەستێت لە تەکفیرکردنی کەسی جاهیل .**

فكلامه ظاهر: في التفرقة بين الأمور المكفرة الخفية، كالجهل ببعض الصفات ونحوها، فلا يكفر بها الجاهل، كقوله للجهمية: أنتم عندي لا تكفرون لأنكم جهال، وقال فيمن ارتكب بعض أنواع الشرك جهلا، لم يمكن تكفيرهم حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم، ولم يقل: لم يمكن تكفيرهم، لأنهم جهال، كما قال في المنكر لبعض الصفات جهلا؛ بل قال: لم يمكن تكفيرهم حتى يبين لهم ما جاء به الرسول صلى الله عليه وسلم فلم ينتهوا، أو إن كانوا جهالا، مع أن قول الشيخ رحمه الله، في عدم تكفير الجهمية ونحوهم، خلاف المشهور في المذهب؛ فإن الصحيح من المذهب: تكفير المجتهد الداعي إلى القول بخلق القرآن، ونفي الرؤية ونحو ذلك

**شیکردنەوە :**

**وتەکانی شێخ ئاشکران لە جیاوازی کردنی لە باسە شاراوە کوفریەکان وەك : نەزانین بە هەندێك بە سیفاتەکانی الله تعالی وە هاوشێوەکانی , کەسی جاهیل تێیدا کافر ناکرێت , وەك وتەی بۆ جەهمیەکان دەفەرموێت: ئێوە لای من تەکفیر ناکرێن چونکە جاهیلن [١٤] وە ئەوکەسانەی کە هەڵگری هەندێك لە جۆرەکانی شیرکن بەهۆی جەهلەوە , ناتوانرێت تەکفیر بکرێت تاوەکو ئیقامە حوجەی دەکرێت لەوەی کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بۆی هاتووە لە دین و شەریعەت , نەی وتووە : ناتوانرێت تەکفیر بکرێن چونکە لەبەر ئەوەی جاهیل و نەزانن , نا بەڵکو ئەم تەکفیر نەکردنە پێش ئیقامە حوجەیە نەوەك هۆکاری جەهل و نەزانین , وەك ئەو کەسەی ئینکاری هەندێك لە سیفاتەکانی الله تعالی دەکات بەهۆی جەهلەوە , بەڵکو فەرمووی : ناگونجێت تەکفیر بکرێن تاوەکو ئیقامە حوجە نەکرێن کۆتایی نایە یاو ئەوەی کە جاهیل و نەزانن , لەگەڵ ئەوەشدا وتەی شێخ لە تەکفیرنەکردنی جەهمیەکان و هاوشێوەی ئەو پێچەوانەی مەزهەب و بیروباوڕی ئەهلی سوونەیە , ڕاست و درووست لە مەزهەب ئەوەیە کە : تەکفیری موجتەهیدی بانگخواز بۆ بیدعەی خەڵقی قورئان و نەفی بینینی الله تعالی و هاوشێوەی ئەوە دەکرێت [١٥]**

---

**(١٤) تەفسیری ئەم وتەی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە چۆنە ؟ ئەوەش وەڵام : ئەم وتەی شێخی ئیسلام زۆرێك لە خەڵك لە زانایان و عەوام بە هەڵە لێی تێگەیشتوون , وە کردوویانە بە ڕێگریەك لە تەکفیرنەکردن , وە عوزر دەدەن بە جاهیل لەسەر کوفرکردنیان , حەقیقەت و ڕاستی ئەم فەتوایە چیە ؟ وە مەبەستی شێخ لەم وتەیە چیە ؟ ئایا شێخ جەهمیەکانی کافر نەکردووە کە بە ئیجماع کافرن ؟ ئایا شێخ عوزری داوە بە کەسێك کە کوفر و شیرکی گەورەبکات ؟ =**

= به ویستی الله وەڵامت دەدەمەوە , پێش ئەوەی بچمە سەر مەبەست و شیکردنەوەی وتەی شێخ , ئەم قسەیەی لە دوو شوێنی ڕیسالەکانی هاتووە ( كتاب بيان تلبيس الجهمية ) وە ( كتاب الرد على البكري في الإستغاثة ) ئەم وتەی شێخ جۆرێك لە نامۆیی و نادیاری تێدایە ئەویش ئەوەیە کە : چۆن ڕوو لە شێخ و گەورە و سەران و خەتیب و قازیەکانی جەهمی دەکات و دەڵێت ( وأنتم عندي لا تكفرون لأنكم جهال ) کە گومانی تێدا نیە وتەکانیان کوفر و لە بازنەی ئیسلام دەرچوونە شتێك نیە کە ڕوون نەبێت , لەگەڵ ئەوەدا کردەوە و وتەکانی جەهمیەکان لە هەموو کوفری کافرێك ڕوونترە , ئەی چۆن کوفری جەهمیەکان لای شێخی ئیسلام نادیار و شاراوەیە ؟ بۆیە تەفسیر و وردبوونەوە لە وتەی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە کارێکی گرنگ و پێویستە وە ورد ببینەوە لە وشەکانی بۆ ئەوەی ئەم ناڕوونی و تەلبیساتەی لە وتەی شێخ هەیە هەڵیدەینەوە بۆ موحیدان و بە هەڵەتێگەیشتووانی وتەی شێخ بخەینە ڕوو ئەوەش وەڵام :

شێخی ئیسلام لەگەڵ ئەم جەهمیانە لە موناقەشە و مونازەرەدابوو شتێکی ئاسان نیە کە لەکاتی مونازەرە وتەکانیان وەسف بکەیت بە کوفر , ئەم کارە بەبێ گومان پێویستی بە تێگۆشان و تەفسیر هەیە لەلایەن (طالب العلم ) کە تا جیاکاری و وردبینی لە عیبارات و جۆرەکانی کوفر بکات , بەڵام ئەگەر ( طالب العلم ) توانای ئەوە نەبوو ئەم جیاوازیانە بکات ئەوە ناشتوانێ بوەستێت و بگات بە مەبەستی شێخی ئیسلام وە ناتوانێت ئەم ڕەمز و کۆدەی عیبارات و وتەکانی شێخ بکاتەوە ئەوە بزانە : کوفر بە ئیعتباری جۆر دابەش دەبێت بۆ ( كفر أكبر - كفر أصغر - كفر في الحال - كفر بالمآل ) ئەگەر جیاوازی نەکەیت لە نێوان ئەم جۆرانە ئەوە بێگۆمان لەسەرت قورس دەبێت لەم وتەی شێخ تێبگەی , ( كفر في الحال ) ئەوە کوفری تەواوە واتە : چ بە کردەوە چ بە وتە حوکم لەسەریان چ بە ( معين ) دیاری کراوی چ بە ( تنوع ) جۆری , ئەوە کافرە و لە میلەت دەچێتەوە دەرەوە , وە ئومەت یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە کافرە وەك : جوێن دان بە دین و شیرك بڕیاردان بە الله تعالی وە پاڵپشتی و سەرخستنی موشریکان بەسەر موسڵمانان , وە ڕەفز کردنەوەی حوکم و شەریعەتی الله تعالی وە کارکردن بە غەیری ئەو , هەموو ئەو کارانە و گشت هەڵوەشێنراوەکانی ئیسلام کە کۆدەنگی موسڵمانانی لەسەرە کە کافر دەبێتەوە , کە ( مكلف ) کافر دەبێتەوە لە حاڵدا مادەم ئیکراهی لەسەر نەبێت , بەلأم ( الكفر بالمآل ) قازی عیاز پێناسەی دەکات دەفەرمووێت (والمقصود به أن يقول قولا يؤديه سياقه إلى كفر كحال بعض أهل البدع والمتأولين) **الشفا بەرگ و پەڕاوی ٢/١٠٥٦ .**
واتە : مەبەست لێی ئەوەیە کە : وتەیەك بڵێت کوفر نەبێت بەڵام بەرەو کوفری ببات وەك حاڵی هەندێك لە ئەهلی بیدەع و گۆڕانکارانی واتا نمونە وەك : نەفی علوی الله تعالی بە درۆ بزانێت کە جێگیرە بە بەڵگە , ئیبنو ڕوشدی حەفید دەفەرمووێت (ومعنى التكفير بالمآل: أنهم لا يصرحون بقول هو كفر، ولكن يصرحون بأقوال يلزم عنها الكفر ) بداية المجتهد بەرگ و پەڕاوی : ٤٩٢/٢ .واتە : واتای تەکفیر بالمآل ئەوەیە : بە صەریحی و ڕاستەوخۆیی ناتوانیت بڵێیت ئەوە کفرە , بەڵام بە دەتوانیت بە صەریحی بڵێیت : وتەکان کوفر پێویست دەکات واتە : بەرەو کوفرت دەبات =

= خەڵك لە تەكفیركردن لەم جۆرە دوو بەشن : بەشێك كافر دەبێت بە ئیعتیباری كە وتەكە بۆی دەچێت وە ئەو كوفرەی كە وتەكەی پەیوەست دەكات ڕوون بێت و هیچ شاراوەییەكی تێدا نەبێت , وە بەشێكی تر كافر نابێت بە ئیعتباری ئەوەی كە پەیوەست بە مەزهەب وەك مەزهەب نیە بۆ خاوەنەكەی , ئەوەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت كە ئیبنو تەیمیە و جگە لەویش : تەكفیری ئەو كەسانەیان نەكردووە تەنها بە ( لوازم أقوالهم ) پەیوەست بە وتەكانیان , ئەوەش وتەی هەندێك لە ئەهلی علم :

قازی عیاز دەفەرموویت (الصواب: ترك إكفارهم والإعراض عن الحتم عليهم بالخسران، وإجراء حكم الإسلام عليهم في قصاصهم، ووراثاتهم، ومناكحتهم، ودياتهم، والصلاة عليهم، ولكنهم يغلظ عليهم بوجيع الأدب، وشديد الزجر والهجر، حتى يرجعوا عن بدعتهم) شفا ١٠٨٤/٢واتە : سەواب ئەوەیە واز لە كافركردنیان بهێنن و پشت بكەیت لە بە دۆڕان ناساندیان بە هەتا هەتایی , حوكمی ئیسلامیان لەسەر جێبەجێ دەبێت لە قیصاص و میرات و زەواج و خوێن و نوێژكردن لەسەریان , بەڵام لەسەریان توند دەبین بە هەڵسوكەوتێكی توند و تیژ وە بە بەهێزی دەیترسێنین و هەجری دەكەین , تاوەكو لە بیدعەكەی دەگەڕێتەوە .

پێناسەی ( كفر في الحال ) بریتیە لە : بەڵگە لەسەری ڕاوەستاو و ئاشكرایە جا بە دەقێكی ڕوون و ئاشكرابێت یان بە ئیجماع بێت , ئەو خاڵەی كە حوكمەكەی لەسەر دادەبەزێت ئاشكرا و ڕوون بێت هیچ خیلافێكی لەسەر نەبێت .

بەڵام ( كفر بالمآل ) هەر لە بنەڕەتدا بەڵگەی لەسەر نیە , بەڵكو بەڵگە ئیجتیهادی زانایە كە ئەم وتەیە مانایەك بەخۆیەوە پەیوەست دەكات كە لە ئەنجامدا دەقەكان بەدرۆ دەخاتەوە

ئیبنو حەزمی زاهیری دەفەرموویت (وأما من كفر الناس بما تؤول إليه أقوالهم فخطأ؛ لأنه كذب على الخصم وتقويل له ما لم يقل به، فصح أنه لا يكفر أحد إلا بنفس قوله، ونص معتقده) الفصل بەرگ و پەڕاوی : ٢٩٤/٣واتە : ئەوەی خەڵك كافر دەكات لەسەر ئەوەی وتەكانیان بەرەو كوفر دەڕوات ئەوە هەڵەیە , لەبەر ئەوەیە درۆی داوەتە پاڵ وە قسەیەكی كردووە كە ئەو نەیكردووە , ڕاست ئەوەیە كە كەس كافر نابێت ئیلا بە خودی قسەیەكی نەبێت , وە دەقی بیروباوڕەكەی.

ئیمامی شاتبی دەفەرموویت (والذي كنا نسمعه من الشيوخ أن مذهب المحققين من أهل الأصول( إن الكفر بالمآل ليس بكفر في الحال) الإعتصام بەرگ و پەڕاوی : ١٩٧/٢ واتە : ئەوەی كە گوێمان لێبووە لە شیخەكانی خۆمان , كە مەزهەبی لێكۆڵەوەران لە ئەهلی عەقیدە ( كفر بالمال ) وەك ( كفر في الحال ) نیە

وتەی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە ( أنتم لا تكفرون عندی لأنكم جهال ) لە جۆری دووهەم دایە ( كفر بالمآل ) نەوەك جۆری یەكەم ( كفی في الحال ) جۆریی یەكەم جێی یەك دەنگی موسڵمانانە , عوزر قەبوڵ نیە تێیدا چ گەورە و زاناكانیان چ عەوام , بەڵام جۆری دووهەم كوفر بە ( لوازم أقوال ) بە هەردوولا عوزر قەبوڵە ,

بۆ زانیاری زیاتری ئەم بابەتە سەیری ئەم سەرچاوانە بكە ( كتاب الشفا قاضي عياض , مجموع الفتاوى غبن تيمية بالأخص جلد ( ٢٠ )الإعتصام للشاطبي )

(١٥) تەكفیرنەكردنی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە لە تەعلیقی ژمارە (١١)ڕوونمان كردەوە .

قال المجد رحمه الله: الصحيح: أن كل بدعة كفرنا فيها الداعية، فإنا نفسق المقلد فيها، كمن يقول بخلق القرآن، أو أن علم الله سبحانه مخلوق، أو أسماءه مخلوقة، أو أنه لا يرى في الآخرة أو يسب الصحابة، أو أن الإيمان مجرد الاعتقاد، ونحو ذلك؛ فمن كان عالما في شيء من هذه البدع، يدعو إليه، ويناظر عليه، فهو محكوم بكفره، نص أحمد على ذلك في مواضع، انتهى

تبين: أن الصحيح من المذهب تكفيره، ولم يعذرهم بالجهل

**شیکردنەوە :**

**ئیمامی مەجد دەفەرمووێت [١٦] : وتەی صەحیح ئەوەیە : هەموو بیدعەیەك [١٧] بانگخوازیکارانیمان کافر کردووە , وە شوێنکەوتوانیشی لە عەوامان فاسق کردووە , وەك ئەوانەی : بانگخوازبوون بۆ خەڵقی قورئان , یان ناوەکانی الله تعالی بە مخلوق دەزانن , یان ئەوانەی کە دەڵێن الله تعالی نابینرێت لە ڕۆژی قیامەت , یان ئەوەی جوێن بە صەحابە دەدات یان ئەوەی دەڵێت : ئیمان هێنان تەنها بیروباوڕە [١٨] وە هاوشێوەی ئەوانە , هەرکەسێ زانا بێت لە شتێك لەم بیدعەیە , وە بانگەوازی بۆ بکات , وە مونازەرەی لەسەر بکات , ئەوە حوکم بەکافرکردنی لەسەر دەدرێت , ئیمامی ئەحمەد لە چەندین شوێن قسەی لەم بارەیەوە هەیە .**

**لەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە صەحیح لە مەزهەب ئەوەیە : تەکفیر دەکرێت و نەزانین بۆی عوزر نیە .**

(١٦).سەیری کتێبی : الفروع ٤٨٩/٦ . الإنصاف ٤٨/١٢ . كشاف القناع ٤٢٠/٦.

(١٧) بیدعەی ( المكفرة )

(١٨) وەك غولاتی مورجیئەکان ئەوە مەزهەبی ئەبو حەنیفەشە .

ومما يوضح المسألة: ما هو معلوم من حكم أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم ومن بعدهم في المرتد، أنه يستتاب فإن تاب وإلا قتلوه، ولم يتوقفوا في قتله حتى تتحقق منه المعاندة؛ وكذلك العلماء في المذاهب، ذكروا حكم من كانت ردته بإنكار ما يمكن جهله به، أنه يعرف ذلك، فإن أصر قتل، ولم يعتبروا تحقق العناد منه، كما قالوا فيمن جحد تحريم الخمر ونحوه، أو شك فيه ومثله لا يجهله، كفر، وإن كان مثله يجهله عرف، فإن أصر بعد التعريف كفر وقُتل، ولم يعتبروا المعاندة.وأيضا، فقد دل القرآن على أن الشك في الجملة كفر، كما في قوله تعالى في الكفار: {قُلْتُمْ مَا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِنْ نَظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ} 1، وغير ذلك من الآيات الصريحة؛ والشك غير العناد، وهذا ظاهر بحمد الله تعالى

**شيكردنەوە :**

**باسەكە ڕوونە : ئەوەی كە زانراوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە لە پاش ئەوان لە سێ سەردەمە زێڕینەكەی سەلەف لە باسی حوكمی ( مورتەد ) ئەوەبوو كە : داوای تەوبەی لێدەكرا ئەگەر تەوبەی بكردبایە , ئەگەرنا دەكوژرا  نەدەوەستان لە حوكمی كوشتنیان تاوەكو ئینكاریان لێ دەبینرا , هەروەها زانایانی مەزهەبەكان باسی حوكمی ئەو كەسانەیان كردووە كە مورتەد دەبوونەوە بە ئینكارەوە كە نەزانین بۆیان گونجاو نەبوو واتە قەبوڵ نەدەبوو , چونكە ئەوانەی مورتەد دەبوونەوە ئەو ڕاستیان دەزانی , ئەگەر هاتوو دوای ڕاستیەكان و بەڵگەكان و ناسینی ئیسلام سووربوو لەسەر دژایەتی ئەوە دەكوژرێت , ئیعتبار بۆ ئەوە ناكرێت ئینكاری دەكات یان نا , وەكو ئەوانەی دەڵێن : هەركەسێ ئینكاری حەرامی شەراب و هاوشێوەی ئەو لە حەرام كراوەكانی تر بكات یان گومانی لە حەرامێتی ئەم حەرام كراوەكان هەبێت وە هاوشێوەی ئەویش كە نەزانین و بێ ئاگایی تێدا قەبوڵ نیە كافر دەبیتەوە , یان ئەوەی كە نەزان بوو پێی لەبەر هۆكارێك لە هۆكارەكانی نەزانین ( دوورە موسڵمانان ..نەگەیشتنی ڕیسالە پێی ..هتد ) بەڵام دواتر دوای ئیقامە حوجە و ناسینی , سووربوو لەسەری ئەوە كافر دەبێت و دەكوژرێت لەوەش ئیعتیبار بۆ ئینكاری كردن و نەكردن نەكردووە , بەڵگە هەیە لە قورئان كە ( گومان و دوو دڵی ) كوفرە وەك الله تعالى لە بارەی كافرانەوە دەفەرمووێت ( واتە : ئەی كافرەكان قیامەت هیچ گومانی تێدا نیە بەڵام ئێوە دەتان ووت : نازانین قیامەت چیە ؟**

دڵنیانین به هاتنی ئێمه تەنها گومانێکمان هەیه بۆ هاتنی , ئەویش بەدەم ئەم و ئەوەوه ئەبیستنین ئەڵێن : قیامەتێك دێت , وه ئێمه یەقیندارین به هاتنەکەی ) وه جگه لەو ئایاتەش چەندین ئایەتی ترمان هەیه گه بەلگەیه لەسەر ئەمه , گومان و دوودڵی بێ ئەوەی ئینکاریش بکات کوفره , ئەوه ئاشکرایه به حەمد و سوپاسی الله تعالی .

ومما يبين لك مراد الشيخ تقي الدين رحمه الله، ما ذكره في بعض كتبه، بقوله: من اعتقد أن زيارة أهل الذمة كنائسهم قربة إلى الله فهو مرتد، وإن جهل أن ذلك الأمر محرم عرف ذلك، فإن أصر صار مرتدا; وقال: من سب الصحابة أو واحدا منهم، واقترن بسبه دعوى أن عليا إله أو نبي، أو أن جبريل غلط، فلا نشك في كفره، بل لا شك في كفر من توقف في تكفيره. وقال أيضا: من زعم أن الصحابة ارتدوا بعد رسول الله صلى الله عليه وسلم إلا نفرا قليلا لا يبلغون بضعة عشر، أو أنهم فسقوا، فلا ريب في كفر قائل ذلك، بل من شك في كفره فهو كافر.

**شیکردنەوە :**

**وە مەبەستی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیەت بۆ ڕوون دەکەمەوە کە لە هەندێك کتێبەکانی باسی کردووە ئەویش ئەوەیە کە : هەرکەسێ باوڕی وابێت کە سەردانی کردنی ئەهلی زیمە [١٩] بۆ کەنیسەکان نزیك بوونەوەیە لە الله تعالی ئەوە موڕتەدە , ئەگەرهاتوو نەزان بوو بە حەڕامێتی ئەوکارە ئەوە دەبێت فێربکرێت و بزانێت دوای زانین ئەگەر سووربوو لەسەر ئەم باوڕە ئەوە موڕتەد دەبێتەوە [٢٠] وە شێخ دەفەرمووێت : ئەو کەسەی جوێن بە صەحابە بدات یان یەکێك لەوان , وە بەستبێتیەوە بە جوێنەکەی بانگوازی ئەوەی کە ئیمامی عەلی ئیلاهە یان پێغەمبەرە یان ئەوەی جوبریل هەڵەی کردووە لە ناردنی ڕیسالە , ئەوە گومانمان نیە لە کافربوونی بەڵکو گومانمان لە کافری ئەو کەسەش نیە کە کافری ناکات و دەوەستێت لە تەکفیرکردنیان [٢١] وە شێخ دەفەرمووێت : هەرکەسێ گومانی وابێت کە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوای ئەو موڕتەد بوونەوە ئیلا چەند کەسێکی کەم نەبن کە ژمارەیان ناگەنە نۆزدە کەسێك , یان ئەوەی بڵێن : فاسق بوونەوەتەوە , ئەوە هیچ گومانمان نیە لە کافربوونی خاوەن ئەم وتانە بەڵکو ئەو کەسانەش کافرن کە گومانی لە کوفری ئەوانەیە [٢٢]**

**(١٩) كشاف القناع** ١٧٠/٦ .
(٢٠) صارم المسلول ١١٢١/٣ .
(٢١) صارم المسلول ١١٢١/٣ .
(٢٢) مجموع الفتاوى ٣٩٥/٣ .

فانظر تكفيره الشاك، مع القطع بأن سبب الشك هو الجهل، وأطلق على من ذكر مع العلم القاطع بأن أكثر هؤلاء أو كلهم جهال لم يعلموا أن ما قالوه كفر.وقال أيضا: فكل من غلا في نبي أو رجل صالح، وجعل فيه نوعا من الإلهية، مثل أن يدعوه من دون الله، مثل أن يقول: يا فلان أغثني، أو ارحمني، أو انصرني، أو اجبرني، أو توكلت عليك، أو أنا في حسبك، أو أنت في حسبي ونحو هذه الأقوال، التي هي من خصائص الربوبية، التي لا تصلح إلا لله، فكل هذا شرك وضلال يستتاب صاحبه، فإن تاب وإلا قتل، انتهى

**شيكردنەوە :**

**سەيربكە تەكفيری شێخی ئيسلام ئيبنو تەيميە بۆ ئەو كەسەی كە گومان و دوودڵی هەيە بەرامبەر تەوحيد , لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە براوەتەوە كە هۆكاری گومان نەزانينە , بە ڕەهايی لەگەڵ ئەوە باس دەكرێت كە زانستی براوەيان هەيە لەسەر ئەوەی كە ئەوانە زۆرينەيان يان هەموويان نەزان و جاهيلن نازانن ئەوەی كە دەڵێن كوفرە , وە هەروەها شێخی ئيسلام ئيبنو تەيميە لە شوێنێكی تردا دەفەرموويێت : هەموو كەسێك زيادەڕۆيی بكات لە پێغەمبەرێك يان پياوچاكێك جۆرێك لە سيفەتی ئيلاهی پێدان , وەك : هاواريان كردن لە غەيری الله تعالى , يان وەك ئەوەی بڵێن : ئەی فلان بە هاوارم وەرە , يان ڕەحمم پێبكە , يان سەرم بخە , يان بمگرە خۆت , يان پشت بەتۆ دەبەستم , يان من لە ژێر باڵی تۆم , يان تۆ لە جێگای هەموو شتێكمی , هاوشێوەی ئەم وتانە , كە تايبەتمەندن بە پەروەردگاريەت , گە ناگونجێت ئيلا بۆ الله تعالى نەبێت , هەموو ئەوانە شيرك و گومڕاييە , خاوەنەكەی داوای تەوبەی لێدەكرێت ئەگەر كردی , ئەگەرنا دەبێ بكوژرێت [٢٣]**

(٢٣) مجموع الفتاوى ٣/٣٩٥ .

ولم يخص القتل بمن تحقق منه العناد، ولم يقل في هؤلاء ونحوهم: لم يكفروا لأنهم جهال، كما قال في الجهمية، وهذا كثير في كلامه رحمه الله.وقال أيضا: لما استحل طائفة من الصحابة والتابعين، الخمر، كقدامة وأصحابه، وظنوا أنها تباح لمن آمن وعمل صالحا، على ما فهموا من آية المائدة، اتفق علماء الصحابة كعمر وعلي وغيرهما، على أنهم يستتابون، فإن أصروا على الاستحلال كفروا، وإن أقروا به جلدوا؛ فلم يكفروهم بالاستحلال ابتداء، لأجل الشبهة حتى يبين لهم الحق، فإن أصروا كفروا، انتهى

**شیکردنەوە :**

**کوشتن تایبەت نەکراوە بەو کەسەی کە ئینکاری دەکات ئینجا بکوژرێت , نەوتراوە بەوانە و هاوشێوەکانی : کافریان ناکەین چونکە نەزانن , وەك لە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمە بە جەهمیەکانی فەرموو [٢٤] کە وتەکانی ئیبنو تەیمیە زۆرە لەم بارەیەوە , وە هەروەها شێخ لە شوێنێکی تردا دەفەرموویت : کاتیٚ کۆمەڵێك لە هاوەڵان و تابعین شەڕابیان حەلال کرد وەك قودامە و هاوەڵانی [٢٥] وا گومانیان دەبرد شەڕاب حەلالە بۆ ئەو کەسەی ئیمانی هێناوە و کردەوەی چاك دەکات , لەسەر ئەم تێگەیشتنەی کە لە ئایەتی سورەی ( المائدة ) [٢٦] هەبوو , زانایانی هاوەڵان وەك : ئیمامی عومەر و پێشەوا عەلی و جگە لەوانیش یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی تەوبە بکەن , ئەگەر نەیان کرد و سووربوون لەسەر حەلالی ئەم حەڕامکراوە ئەوە کافر دەبنەوە , وە ئەگەر دانیان پێدانا ئەوە قامچی ڕێژ دەکرێن , کافر نابن لەسەرەتای حەلال کردنیانەوە لە پێناو هەبوونی گومان لەسەر شتەکە , تاوەکو بۆی ڕوون دەکرێتەوە , ئەگەر هەر سووربوو دوای ڕوون کردنەوە ئەوە کافرە [٢٧]**

**(٢٤) لە تەعلیقی (١٢) ئەم وتەمان ڕوون کردەوە .**

(٢٥) الرد على البكري ص : ٤٩٢ .

(٢٦) **بۆ زانینی ئەم چیرۆکە برۆ سەیری** : سنن الكبري للنسائي ٥٢٧٠ , مصنف لعبدالرزاق ٢٤٠/٩ **لە حەدیسی ئیبنو عەباس .**

(٢٧) سورة المائدة . أية : ٩٣.

فانظر كيف حكم الصحابة بكفرهم، لو أصروا بعد الاستتابة، ولم يعذروهم بعد المعرفة، وبعد التعريف، فأوضح مما ذكرناه: ضلالا من لم يكفر من ارتكب ما هو كفر، إلا إذا كان معاندا، وأن هذا مخالف للكتاب والسنة، وإجماع الأمة. فكيف يقول هذا فيمن يشك في وجوب الرب سبحانه وتعالى، أو في وحدانيته، أو يشك في نبوة محمد صلى الله عليه وسلم أو في البعث بعد الموت، فإن طرد أصله في ذلك فهو كافر بلا شك، كما قرره موفق الدين في كلامه المتقدم، لا يعذر بالشك في هذه الأشياء، وعذر فاعل الشرك الأكبر، المناقض لشهادة أن لا إله إلا الله، التي هي أصل دين الإسلام بجهله؛ فهذا تناقض ظاهر.

**شیکردنەوە :**

**سەیربکە چۆن صەحابەکان حوکمی کافربوونیان لەسەردان , بە مەرجێك پێداگریان بکردبا لە پاش تەوبە کردن , عوزریان بۆ نەهێنانەوە پاش ناسینی , وە پاش زانست بوون بە حەڕامی کارەکە , ئەوەی باسمان کرد ڕوون و ئاشکرایە : گومڕایە ئەو کەسەی ئەوانە کافر ناکات کە هەڵگری کوفرێکن , ئیلا پاش بە دیار کەوتنی ئینکاری , ئەوە بەڕاستی پێچەوانەی قورئان و سوونەت و ئیجماعی ئوممەتە , جاچ جای ئەوەی ئەوە بڵێیت , هەرکەسێ گومانی هەبێت لە بوونی الله تعالى یان لە تاك و تەنهایی ئەو , یان گومانی هەبێت لە پێغەمبەرایەتی محمد صلی الله علیه وسلم , یان گومانی هەبێت لە ڕۆژی زیندوو بوونەوە پاش مردن , ئەوە هەرکەسێ دەرچێت لەم ئەصڵە ئەوە کافرە بەبێ هیچ گومانێك , وەك شێخ موفق الدین لە باسەکانی ڕابردوو ئیقراری لەسەر کرد , گومان عوزر نیە لەم شتانە , عوزر هێنان بۆ بکەری شیرکی گەورە هەڵوەشێنەوەی شەهادەی ( لا اله الا الله )یە بەهۆی جاهیل بوون لێی کە تەوحید و یەکخوا پەرستیە ئەصڵی دینی ئیسلامە , ئەوە پێچەوانەیەکی ڕوون و ئاشکرایە.**

فقد بين أنه لا عذر لأحد في الجهل بهذه الأمور ونحوها، بعد بعثته صلى الله عليه وسلم وبلوغ حجج الله وبيناته، وإن لم يفهمها من بلغته، فحجة الله قائمة على عباده ببلوغ الحجة لا بفهمها، فبلوغ الحجة شيء وفهمها شيء آخر؛ ولهذا لم يعذر الله الكفار بعدم فهمهم، بعد أن بلغتهم حجته وبيناته، وهذا ظاهر بحمد الله.فنسأل الله ألا يزيـغ قلوبنا بعد إذ هدانا وأن يهب لنا من لدنه رحمة إنه هو الوهاب.

**شيكردنەوە :**

**ئەوەمان بۆ ڕوون بۆیەوە كە عوزر بە جەهل بۆ هیچ كەسێك نیە لەم بابەتە و هاوشێوەكانی پاش ناردنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم , وە گەیشتنی بەڵگە و ڕوونكردنەوەكان ئەگەرچی لەم بەڵگانەش تێنەگەیشتبن , چوونكە بەڵگەكانی الله تعالى بۆ سەر بەندەكانی [٢٨] وەستاوە لەسەر گەیشتنی بەڵگە نەوەك تێگەیشتن لێی , چوونكە گەیشتنی بەڵگە شتێكە و تێگەیشتن لێی شتێكی ترە , لەبەر ئەوەشە الله تعالى عوزری لە كافرەكان قەبوڵ نەكرد بە تێنەگەیشتنیان پاش ئەوەی گە بەڵگەكانی الله تعالى بۆ چوو , ئەوە شتێكی ئاشكرایە بە حەمدی الله تعالى .**

**داواكرام الله تعالى دڵم گومڕا نەكات پاش ئەوەی هیدایەتی پێ بەخشین وە لە ڕەحم و بەخشیشیی خۆی بێ بەشمان نەكات بەڕاستی هەر ئەو بەخشەرە**

---

**(٢٨) لە كافركردن و موشریك كردن .**

**له کۆتایدا دەڵێم :**

**سوپاس بۆ الله تعالی توانیم ئەم ڕیسالەیە لە ڕێکەوتی ( ١٠ – ٦ – ١٤٤١ کۆچی بەرامبەر ٦ – ٢ – ٢٠٢٠ عیسایی ) تەواوم بکەم وە شیکاری و تەعلیقاتی بۆ بکەم لە هەولێر – کوردستانی باشوور – عێراق پاش , لە ڕۆژی پێنج شەم پاش نوێژی بەیانی , داواکارم لە الله تعالی ئەم کارەم لێ وەرگرێت و ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونی بۆ برایان و خوشکانم وە بەهەشت بکاتە کۆتا ماڵی ڕێبوارانی نامۆی ئەم تەوحید و یەکخوا پەرستیە ...اللهم أمین .**

**براتان : هاوکار کوردی**

## سەرچاوەکان

**یەکەم : قورئانی پیرۆز**

**دووهەم : صەحیحی بوخاری**

**سێ یەم : مجموع الفتاوی ئیبن تەیمیە**

**چوارەم : صارم المسلول لشیخ ئیبنو تیمیه**

**پێنجەم : جامع المسائل ئیبنو تەیمیە**

**شەشەم : المستدرك على مجموع الفتاوی**

**حەوتەم : الرد على البكری**

**هەشتەم : کتێبی شفا قازی عیاز**

**نۆیەم : اعتصام ئیمامی شاتبی**

**دەیەم :** السحب الوابلة على ضرائح الحنابلة

**یازدەهەم :** فيض الملك الوهاب المتعالی بأنباء أوائل القرن الثالث عشر والتوالي

**دوازهەم :** الدرر السنية في الأجوبة النجدية

**سێزدەهەم** : الأعلام للزركلی

**چواردەهەم** : تراجم لمتأخري الحنابلة

**پازدەهەم** : مشاهير علماء نجد وغيرهم

**شازدەهەم** : علماء الدعوة

**حەڤدەهەم** : تسهيل السابلة لمريد معرفة الحنابلة

**هەژدەهەم** : علماء نجد خلال ستة قرون